# خۆری ئیسلام

3



گۆڤارێکی ڕۆشنبیری زانستی ئیسلامی وەرزی یە
وەزارەتی ئەوقاف وکاروباری ئیسلامی دەری دەکات

شەوال ـ ذی القعدە / ١٤١٩ ک • رەشەمێ ی / ٢٦٩٨ کوردی • شوباتی / ١٩٩٩ زاینی



(١٠) هەزار دانە قورئانی پیرۆز
دیاری بەڕێز نێچیرڤان بارزانی



لەلایەن وەزیری ئەوقافەوە بەسەر تێکرای مزگەوتەکانی هەرێمدا دابەش کرا



مزکەوتی کەژەک

# ئایینی ئاشتیو هوشیاری مرۆڤو پێشکەوتنی کۆمەڵگا

مەحمودکاوە حەفیدزادە

وەزیری ئەوقافو کاروباری ئیسلامی

دوای ئەوەی کابینەی سێهەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان کاروانی دوو ساڵ لەتەمەنی پڕ شکۆی، بەکۆمەڵێك پرۆژەی گرنگو کارو چالاکییەکی زۆری جۆراوجۆری خزمەتگوزاری، بەرێ خستو هاوکات، پارساڵیش، بەکۆمەڵێك پرۆژەی جۆراوجۆر خۆی خستەوە، مەیدانی کارو بەهەمان پیشەی ساڵانی رابردوو دەستی بەکار کردەوەو بەم شێوازە بەرێ کراو، لەرێچکەی پیرۆزی کارکانیەوە پێی نایە ساڵی نوێی تەمەنیەوەو لەو کلاورۆژنەیەوە، سەلماندی کەکابینەیەکی خزمەتگوزارەو لەخزمەت هاوولاتیانو جەماوەری موسڵمانی گەلەکەماندایە. بێ شك ئەم کابینە شکۆمەندە، هەر لەبەرەبەیانی مێژووی دەست بەکاربوونیەوە، تا ئەمڕۆدا.. بەردەوام بووەو بەردەوامە لەپێشکەشکردنی بەرنامەی پیرۆزی کارو چالاکیو پرۆژە خزمەتگوزارییەکانی بەمەبەستی چاککردنی باری سەختو دژواری ژیانو گوزەرانی هاوولاتیانی هەرێمی کوردستانو هاوکات بەئەرکی سەرشانی خۆی زانیوە لەم ڕاڕەوەوە، بچێتە ئەو مەیدانەو لەو روانگەیەوە گەورەترین خزمەتو خزمەتگوزاری پێشکەش بەو گەلە ستەم دیدەیە بکات، کەزیاتر لەنیو سەدەیە خەباتو کۆشش لەسۆنگەی، دامەزراندنی حکومەتێکی خزمەتگوزارو کوردی لەو جۆرە، دەکات کەدەریایەك خوێنی بۆ کردۆتەوە دیاریو خەلات، ئاشکرایشە بوونی ئەو ئەزموونەو پیادەکردنی ئەم پرۆسەو بەرنامەیەی کابینەی سێهەمیش بەری رەنجی شەهیدانی سەربەرزی گەلەکەمانو مێژووی نیو سەدەی خەباتی سیاسی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانو (سەرۆکی نەتەوەییمان: بارزانی نەمر)ە، هەر بۆیەش لەم پێودانگەوە. دەروانینە ئاسۆی دوارۆژی، ئەیلولو گولانی ئەم گەلەی لەراپەرینەوە، سەرچاوەی گرتو لەپەرلەمانو حکومەتی هەرێم دا، خۆی بینیەوەو کابینەی سێهەمی خزمەتگوزاری کردە دیاریو خەلاتی ئەو میللەتەی زیاتر لە(٥٠) ساڵە کاروانی بەرێ خستووە. بێ گومان ئێمەش وەك وەزارەتی ئەوقافو کاروباری ئیسلامی، هەر لەسەرەتای دەست بەکاربوونمانەوە تا بەئەمڕۆ دەگات، بەدەیان پرۆژەی خزمەتگوزاریمان بەئەنجام گەیاندوە. سەبارەت بەزیاتر خزمەت گەیاندن بەمامۆستایانو زانایانی ئایینیو دەست گیرۆیی کردنی هاوولاتیانی هەژارو کەم دەرامەتو بێ سەرپەرشتو نابیناو، دروست کردنو نۆژەن کردنەوەی مزگەوتو تەکیەو مەرقەدو شوێنە پیرۆزەکانی ئایینی.. ئەمەو بۆ ساڵی نوێش بەهەمان بەرنامەی کارو بگرە زیاتر لەساڵانی رابردوو دێینەوە، گۆڕەپانی کارە خزمەتگوزارییەکانمانو هەوڵ دەدەین بەهاوکاری زانایانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی، تەفرەقەو گرفتەکان، چارەسەربکەین، هەروەك چۆن (بارزانی نەمر) هەوڵی دەدا لەرێگای هاریکاریو راپرسی مامۆستایانو زانایانی ئایینییەوە، زۆر لەکێشەو گرفتە ئایینیو کۆمەلایەتیەکانی کۆمەڵو کۆمەڵگاکەی، بن بەست بکات، بۆیە پێویستە ئێمەش لەرێگای وەزارەتو هزری عولەمایانی ئیسلامەوە، کێشەکانمان چارەسەر بکەینو تەفرەقەو دووبەرەکی نەهێڵینو لەمونتەلەقی پیرۆزی کارەوە، کار بۆ سەرخستنی ئەزموونی دیموکراتی گەلەکەمان بکەینو لەسایەی ئاشتیو تەباییو ئارامیو برایەتیدا، بەرنامەی کارەکانمان پیادە بکەین.. بەتایبەتی لەرۆژگاری ئەمڕۆ کەکورد. حکومەتێکی هەیەو نیو سەدەشە قوربانی لەپێناو دامەزراندنیا داوە، پێویستە پشتگیری لێ بکرێتو لەرۆشنایی رێنماییو راسپاردەکانی بەرێز جەنابی سەرۆك بارزانیەوە ئیلتیزامی پێوە بکرێتو کار بۆ تۆکمە کردنی بکەین، بۆ ئەوەی لەم روانگەیەوە بتوانین ئیدارەی خۆمان باشتر ببەین بەرێوەو لەو مینبەرەوە، داکۆکی لەکیانو مافی رەوای گەلەکەمان بکەینو رێگا نەدەین، ناحەزانو دوژمنانی ناوخۆی وەك (PKK)ی تیرۆریستو داردەستی بێگانە؛ لەمەنفای خەونە نەزۆکەکانیەوە، جارێکی تر ببێتەوە، مۆتەکەی سەر سنگی هەرێمو ئەزمونە دیموکراتیەکەیو، بکەوێتەوە، تیرۆرکردنی مامۆستایانو زانایانی ئایینیو روخاندنی مزگەوتو تەکیەو مەرقەدو تەقاندنەوەی پردو شوێنە پیرۆزەکانی تری ئایینی، کەئێستاش لەو سیاسەتە ئیفلاس بووە، شێلگیرانەیەی بەردەوامەو بۆی تەرك ناکرێ ئەوەتا لەو چەندانەی دواییشدا خودی عەبدوڵلا ئۆجەلانی سەرۆکی PKK لەرێگای ئۆرگانی جنێو ئامێزی (ولات)و تەلەفزیۆنە شەقو شڕەکەی (مەدتیڤی)یەوە، دەم شڕانە هەڵیکوتاوەتە سەر رۆشنبیرانی کوردو جوێن بارانی کردوون، کەگوایە بەم جنێو فرۆشیەی قەرەبووی سیاسەتی فەشەل بووی خۆی لەرۆشنبیرانو زانایانو روناکبیران دەکاتەوە؛ دیارە ئێمەش وەك وەزارەتی ئەوقافو کاروباری ئیسلامی هەرێمی کوردستان، دەنگمان دەخەینە پاڵ دەنگیناڕەزایی رۆشنبیرانی کوردو ئەو سیاسەتە جنێو فرۆشیەی ئۆجەلان، ئیدانەو مەحکوم دەکەینو لەو دەلاقەیەوە، خۆمان بەمینبەری حەقیقەتو پارێزەری کیانی کوردو رێبازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەزانینو هاوکات رۆڵی کاریگەرو بەرچاوی جەنابی سەرۆك بارزانی لەپشتگیری کردنی مامۆستایانو زانایانی ئایینی، بەهەند هەڵدەگرینو بەردەوام دەبین لەخزمەتکردن بەگەلو نیشتمانو ئایینیپیرۆزی ئیسلامو لەکلاورۆژنەی ئەم میحرابەوە دەڕوانینە ئاسۆی دواڕۆژی میللەتو ئەزموونە دیموکراتیەکەی، کە لەیەکەم پەرلەمانی هەڵبژێردراوی جەماوەری گەلەکەمانو حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بەرجەستەبوو.. کەئەمەش خۆی لەخۆیدا، بەرپەرچ دانەوەی نەخشەو پیلانی ژاراوی دوژمنانی ناوخۆو سەرکوت کردنیانە، کەهاوکات لەگەڵ جێبەجێ کردنی رێککەوتننامەی ئاشتی واشنتنو هەوڵە بەردەوامە کاتی ئاشتیو گەڕانەوەی متمانە ئەو تۆکمە کردنی گیانی تەباییو برایەتیدا دێتەدی..

پێکەوە بەرەو ئاشتیو سەرخستنی ئەزموونەکەمان

# خۆری ئیسلام



3

سالی یەکەم

شەوال - ذی القعدة ١٤١٩ك

ڕەشەمێی ٢٦٩٨ی کوردی بەرامبەر شوباتی ١٩٩٩ز

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری زانستی ئیسلامی وەرزییە

وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی دەری دەکات



خاوەنی ئیمتیاز

مەحمود کاوە حەفیدزادە

سەرنووسەر

مەلا ئەحمەدی خانەقا

جێگری سەرنووسەر

حاکم جەمال جەلال

سکرتێری نووسین

حەمە ئەحمەد جاف

سەرپەرشتکار

عەدنان حاجی کاکە




* دابەشکردنی (١٠)هەزار لەقورئانی پیرۆز.. ل١٣

* مامۆستایانی ئایینی سیاسەتی تیرۆریستانەی PKK مەحکوم دەکەن .... ل٢٤

* کردنەوەی مزگەوتی (کەژەك)... ل١٨




ناونیشان

هەولێر - دیوانی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی (نووسینگەی ڕاگەیاندن)



سەرنووسەر : (٤٠٨٣) (٢٠٤٨٦)

جێگری سەرنووسەر : (٤١٣٩) (٢٢٦٩٢)

سکرتێری نووسین : (٤٦٧٧)

سەرپەرشتکار : (٢٢٧٥١)



پیتچنین و دەرهێنانی هونەری : کۆمپیوتەری (ئەپلس)

# ناوەرۆك



# لابردنی دیاردەی ناپەسەند نیشانەی مرۆڤ دۆستی یە

أذن للذين يقاتلون بأنهم ظلموا وان الله على نصرهم لقدير.. صدق الله العظيم

سەرنووسەر

ژیارو شارستانی تەنها بەقسەو رستە دروست نابێ، تەنها بەهاوارو هاشەو بانگەشە نابێ، تەنها ڕێگە بۆ سەلماندنی شارستانی و ژیارو ڕەسەنایەتی هەر نەتەوەیەك بەکردەوەی ڕۆژانەوە بەردەوام نیشان دەدرێ، میللەتی عەرەب هەتا لەژێر سایەو سێبەری قورئـان و فـەرموودەو پەرچەمی ئیسلامدابوون هەمیشە بۆ ڕزگاریو ئازادیو بەختیاری گەلان هەوڵو خەباتیان دەکردو هەمیشە جێگەی هیواو ئومێدی گەلانی ژێردەستەو زوڵم لێکراو بوون و مێژوو شاهێدە کە لەئازایەتی و پیاوەتیو دەست گوشادیو گشت ڕەوشتە بەرزەکان مامۆستای میللەتان بووە، بەڵام پاش ئەوەی خاکی پیرۆزی ئیسلامیان بەهەرزاندا بەجوولەکەو سەروەریو شکۆی عەرەب و ئیسلامیان بەسووك و ئاسان لەدەستدا ئەوجا مەترسی کەوتە سەر زەوت کردن و داگیرکردن و بەعەرەب کردن و گۆڕینی سیمای نەتەوایەتیو میللی کوردی براو هاوسەنگەری عەرەب، لەبەر ئەوە زۆر پێویستە بەقووڵی و توندی باسی ئەوە بکەین کە دیاردەی (تعریب، ترحیل، تەهجیرو...) بکەین بەکارێکی زۆر ناپەسەندو نامۆو ناشیرین و دوور لەهەموو ڕەوشتێکی عەرەبیو ئینسانی و ئیسلامی دابنێین کەهەموو نرخ و بەها بەنرخەکانی عەرەب دەخاتە بەر مەترسی ڕاستەقینەوەو زیاتر ئەو هاوکێشەیە دەسەلمێت کە عەرەب بەبێ ئیسلام لاشەیەکی بێ گیان و جەستەیەکی بێ هەستە، هەستێکی بێ سۆزەو لەهەموو دڕندەیەکە بەسەر عەرەبدا سەپاوە خراپترە (وظلم ذوي القربى أشد مضاضة) هەتا عەرەب خاوەن خەلافەو میرایەتیو مەزنایەتیو ڕابەرایەتی بووە، کورد تەنها یەك بست زەویو خاك و ئاوی داگیر نەکراوە، کورد لەگەڵ عەرەبدا وەك برا ژیاوە، ئەگەر کۆیلەو بەندە بۆ گەلانی غەیرە کورد بووبێت بۆ کورد نەبووە، کوردستان بەئاشتیو ئارەزوو چووەتە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە کە عەرەب ڕابەری بووە، ئەوەش لەبەر ئەوە بووە کورد بەڕاستی خزمەتی ئەرزو خاك و بەروبووم و کشتوکاڵو بەرهەم و ئاژەڵداری بووە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بەئاشکرا خۆ خەریك کردن بەکشتوکاڵەوە بەپێی فەرموودە بەعەرەب پەسەندو ساز نەبووەو قەدەغە بۆیان.

بەڵام ئێستا، خاکمان، ماڵمان، کشتوکاڵمان، ئاوو زەوی بەپیتمان داگیر دەکەن و خەڵکی خۆیان لەجێگەمان نیشتەجێ دەکەن و هەموو ڕۆژو شەو گازاندەیان لەجوولەکەیە کە زەوی عەرەب زەوت دەکاو داگیری دەکات و سیمای دەگۆڕێ شەرمان پێ دەفرۆشن لەماڵی خۆمان و زۆر ماندوو سەخڵەتن کە کورد کیانی هەبێو ئیستعماری (٢٤) دەوڵەت کیان و ئاڵاو سەربەخۆیی پێ بەخشیون، بەڵام بۆ کورد



قەدەغەیـە سـەروەری هـەبێ، زەوی پـڕ لەبەرەکـەتی باشوور چۆڵ دەکەن و خەڵکەکەی راگوێز دەکەن بۆ کوردستان.

ئەوە کەی رەوای هەقە، ئەوە کەی لەگەڵ رەوشتی عەرەب دەگونجێ ئەوە کەی برایەتی وادەبێو دەها پرسیاری بێ وەلام، خۆ ئەگەر بڵێین ئەوە تاوانی رژێمە ئێمەدەڵێین گەلی عەرەب چۆن قەبولی دەکات و خاکی خۆی چۆل بکات بۆ بیابان و زەوی کورد داگیر بکات، بەراستی خەڵکینە (تعریب) کارێکی بێ رەوشتانەیە، نەفامانەیە، گەوجانەیە، دیاردەیەکی پیس و گلاو و قێزەونە، پاشگەزبوونەوەیە لەئیسلام، لەمرۆڤایەتی و لەرەوشتی عەرەب دوورە و بێ وەفاییە بەرامبەر بەخوێنی ئاڵو گەشی کورد کە بۆ رزگارکردنی خاکی عەرەب رژاندویەتیو غەدرێکەو لەصەلاحەدین و قودس و فەلەستین دەکرێ.

بەبەرچاوی هەموو دونیاوە بێ شەرم و بێ حەیا و بەزۆرو بەستەم زەوی و ژیان و مرۆیی خەڵکی کوردی هەژارو کاسب و بەرهەمدار بۆ کەسانی بێ کار و بێ زانست و بێ ئەزموون داگیر دەکەن، خۆ ئەگەر ئامێری پیشەسازی بشارێتەوە لێیان هیچ نازانن. بەلام کورد بەکۆڵ گڵ لەسەر بەرد دەنێو بەرهەمی لێ وەردەگرێ و خۆیو خەڵك بەخێودەکات، بەراستی ئەو زوڵمە چەندە سەخت و دژوارە، چەندە بەئێش و ئازارە بێ دەنگی لەبەرامبەری ئەوە تاوانترەو ترسنۆکیو داماویەو شەڕ بۆ هەر شتێکی تر ناڕەوا بێ بۆ دژی تەعریب حەق و رەوایەو کەس نکوڵی لێ نییە، چونکە بەرنامەی (تعریب) لەیەکەم رۆژی دامەزراندنی بەناو حوکمی نیشتمانی عیراق دانراوە بێ دەنگی ئێمەش بەڵگەی ئەوەیە لەشی مردوو هەست بەئازار ناکات، دەنا دەبوو هەموو دنیا ئاگاداری ئەم زوڵمە بێ. لەبەر ئەوە زۆر پێویستە قەڵەم، نامە، کتێب، هەموو هۆکارە راگەیاندنەکان بەدەنگ و رەنگ و نووسینەوە لەکاردابێ بۆ لابردنی ئەم درمە، ئەم نەخۆشیە، ئەم تاعونە، ئەم شێرپەنجەیە، دەبا هەموو پێکەوە هەوڵ بدەین بۆ لابردنی (تعریب).

من لم یرد عن حوم بسلاحه یهدم ومن لایظلم الناس یظلم.

رسوا بێت تعریب، بشکێ دەستی زۆرداری، گۆج و کاس بلا ئەوەی بەرگری لەمافی خۆی نەکات.

تەنها ئەوە ماوە کە ئاماژەی پێ بکەین، لەحاڵەتی بەردەوامی دەرکردن و بەعەرەب کردن و سووربوون لەسەر ئەم دیاردە نامۆیە مافێك بۆ کورد دروست دەبێ کە بەرگری لەخۆیو خاکی بکات، دیفاعێکی مەشروع و پەسەندو یاساییە، کەشەرع ناوی دەبات بە (دفع الصائل) کە هەرکەس پەلاماری گیان و ماڵو شەرەف و ژێری کەسێك بدات پەلاماردەر بەجەهەنەم شاد دەبێو خاوەن حەق جێگەی بەهەشتی بەرینە و شەهیدە لای خوا.

چونکە بەرگری لەگیان و سامان مافی تاك و کۆمەڵە، بڕیاری لەسەرە بەپێی شەرع و یاسای نێودەوڵەتی (کل المسلم علی المسلم حرام دمه وماله وعرضه) ئەو مافەش ئێستە لەئەستۆی رژێم و هەر کەس کە بەگوێی رژێم بکات دایەو لەسەر حکومەتی هەرێمی کوردستان پێویستە بەرگری لەژیان و شەرەف و خاك و زەوی کوردستان بکات و بەهەموو رێگەیەکی یاسایی و ئاسایی (من قتل دون ماله فهو شهید).

ئیجماعی زانایان هەیە کە بەرگری شەرعیە و کەس نابێ پەلامار قەبوڵ بکات نەك لەکاتی روودانی، بەڵکو لەکاتی گومانی پەلاماردا بەرگریو بەرپەرچ دانەوە مەشروعە (فمن اعتدی علیکم فاعتدوا علیه بمثل ما اعتدی علیکم) ومن قصد بأذی في نفسه او ماله او حریمه فقاتل عن ذلك وقتل فلا ضمان علیه فتح قریب)ص٧٦.

لەکۆتاییدا دووبارە ئایەتە پیرۆزەکە دووبارە دەکەینەوە وەك ئاگادارکردنەوەو دەڵێین (لقد اعذر من انذر).

﴿أُذن للذین یُقاتلون بأنهم ظلموا وإن الله علی نصرهم لقدیر﴾ صدق الله العظیم.

* * *



## ئایینی پیرۆزی ئیسلام

# لەدیدوبۆچوونی جەنابی سەرۆك بارزانیدا

حاکم جەمال - بەڕێوەبەری گشتی دیوانی وەزارەتی ئەوقاف‌و کاروباری ئیسلامی

هاوکات لەگەڵ دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان‌و سەرکردایەتی کردنی (بارزانی نەمر)، پاراستنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام‌و گرتنەبەری ڕێبازی مەزهەب‌و ئایین بوو بەیەکێك لەدروشم‌و ئامانجە نەتەوەییەکانی پەیڕەوو پڕۆگرامی ئەو پارتەی بارزانی نەمر سەرۆکایەتی دەکرد بێگومان پارتی دیموکراتی کوردستان لەساڵی (١٩٤٦)ی زایینیدا لە ناواخنی مەزهەبە پیرۆزەکانی ئایین‌و لەواقیعی فکرو دیدو بۆچوونی گەلێکی موسڵمان‌و ئایین پەروەردا هاتە ئاراو بە پێشەوایەتی کردنی ڕێبەرێکی سیاسەتمەدارو ئایینی وەك جەنابی مەلا مستەفای بارزنی نەمر دامەزراو لە ڕۆشنایی ئەم ئاینەشەوە درێژەی بەخەباتی سیاسی‌و چەکداری‌و ڕۆشنبیری ئیسلامی داو لەو پێناوەشدا بە هەزاران هەزار شەهیدی بۆ کردە خەڵات‌و دیاری، کەشایانی شانازی پێوەکردنیەتی، بەڵگە نەویستیشە. بارزانی نەمر وەك ڕێبەرێکی ئایینی ناوداری سیاسەتمەدارو سەرۆکێکی مەزنی نەتەوەی کورد لەڕووی جێ بەجێ کردنی بەرنامەی کاری پارتە شۆڕشگێڕە پێشڕەوەکەیەوە، قەناعەت‌و بڕوایەکی تۆکمەو پتەوی بەڕێبازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و بگرە زۆر دۆست‌و ئاشنای، ماموستایان و زانایانی ئایینی بوو، کەهەردەم دەیویست زۆر لە ئازارو ئەشکەنجەو نەهامەتی‌و ناکۆکیەکانی نێو کۆمەڵ‌و کۆمەڵگاکەی لەڕێگای واتاو حیکمەت‌و فەلسەفەو یاسای ئیسلامەوە چارەسەر بکات بۆیە لەم ڕوانگەیەوە ڕێزو ستایشی تایبەتی لەزانایان‌و ماموستایانی ئایینی دەناو پشتگیری‌و هاریکاری تەواوی دەکردن، بۆ بەڵگەی ڕاستی ئەم وتەیەشمان لەڕۆژی ١٩٧٠/٩/٢١دا لەکاتی بەستنی یەکەم کۆنگرەی زانایانی ئایینی ئیسلامی لەگەڵاڵە (بارزانی نەمر) تەشریفی هێنایە نێو کۆنگرەو لەوتەیەکدا، وێڕای پیرۆزبایی‌و سەرکەوتنی کۆنگرەکە لێیان، داوای لێکردن کە (عەمەل بەقورئانی پیرۆز بکرێت‌و ئەمری خوا تەنفیزبکەن) ئەمەو لەکۆتایی وتە بەنرخەکەدا، پشتگیری و هاریکاری خۆی بۆ دووپات کردنەوە، بەڵی... بارزانی نەمر زۆر قینی لەوەسف‌و ستایش‌و مەدح‌و سەناو پیاهەڵدان دەبۆوە، بۆ ئەمەش لەوتەیەکیدا دەیفەرموو (خوای گەورە ئێمەی خەڵق کردووە، هەمووومان عەبدی ئەوین، بۆیە هیچ فەرق‌و فروقێك لەنێوان مرۆڤ‌و مرۆڤدا نییە، تەنانەت ئەو کەسە گەورەیە، کەخزمەتکاری گەل‌و خاك‌و نیشتمانەکەی بێ) ئەمەو بارزانی نەمر دژی زوڵم‌و زۆرو ستەم بوو، وەفاداربوو لەگەڵ ئەوکەسانەی کە لەگەڵیدا دەژیان‌و ژیاون‌و زۆریش بەهانای



لێقەوماوانەوە دەهات، ئەوەتا لەوتەیەکی بەنرخی دیکەیدا دەفەرمووێ (من ئینسانێکی ئیسلامی کوردم هەمیشە دەمەوێ دەستی چەوساندنەوەو زوڵم ببڕم، بۆ ئەوەی چیتر مرۆڤی کورد غەدری لێ نەکرێت) بەڵێ ئەمانە هەر هەمووی مەنهەج و بەرنامەی کاری پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرۆکی نەتەوەیی کورد (بارزانی نەمر) بوون بەمەبەستی داکۆکیکردن لە قورئانی پیرۆزو گرتنەبەری ڕێبازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و پشتگیری کردن لێی هەر بۆیەش بەڕێز (جەنابی سەرۆك بارزانی)، لەو نەهج و مەنهەجە پیرۆزەی (بارزانی نەمر) و سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان بەمەبەستی خزمەت کردن بەرێبازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەڕوانێتە: ئاسۆی روونی ئەم ئایینە پیرۆزە لەهەرێمی کوردستاندا، ئەمەو راوبۆچوونی بەڕێز جەنابی سەرۆك بارزانی بەرامبەر چەسپاندنی ڕێبازی ئیسلام و جێ بەجێ کردنی داب و نەریتی ئایینی لەکوردستاندا، بنەمای بوونی گەلێکی موسڵمان و سەرۆکایەتی کردنی ئەو گەلە دەگرێتە ئەستۆ کە لەمێژووی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردو مێژووی دێرین و هاوچەرخی ئایینی پیرۆزی ئیسلام شوێن و مەکانەی بەرزی خۆی هەیە و پێویستە لەرادە بەدەرحورمەتی بگیرێ و پارێزگاری لەشکۆمەندیەتی و سەروەریەتی ئەم زاتە بکرێت کەبەرامبەر گەل و نیشتمان و ئاینەکەی وەفاداری نواندوەو دەنوێنێ ئەمەو لەرۆشنایی، رێنمایی و راسپاردە گرنگەکانی جەنابی سەرۆك بارزانی بەرامبەر چەسپاندنی ڕێبازی ئیسلام و جێ بەجێ کردنی ئەم ڕێبازە لەهەرێمدا پەرلەمان و سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران. لەسەرجەم سیمینارو کۆڕو کۆبوونەوەکانیاندا، بەناوی خواو گەل. کوردستانەوە دەروازەی حیوارو گفتوگۆکانیان دەکەنەوەو مامەڵە لەگەڵ رەوتی یاساو بڕیارە پەسندکراوەکانیاندا دەکەن جگە لەمەش سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران لەتروسکەی رۆشنایی وتەو رێنماییە پیرۆزەکانی بەڕێز جەنابی سەرۆك بارزانیەوە بەرامبەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام و بەئەنجام گەیاندنی پڕۆژە خزمەتگوزاریەکانی ئایینی لەبنیات نان و نوژەن کردنەوەی مزگەوت و تەکیەو خانەقا و مەرقەدو قوتابخانەو شوێنە پیرۆزەکانی ئایینی لەهەرێمی کوردستاندا هەنگاوە عەمەلیەکانی بەردەوام و چەندین هەنگاوی دیکەی لەم رووەوە، خستۆتە ئەستۆ کەئەمانە هەر هەموویان لەرێگای وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی هەرێمی کوردستانەوە سەرپەرشتی دەکرێن، ئاشکرایشە داکۆکی کردن لەو رێبازەو پشتگیری کردن لەمامۆستایان و زانایانی ئەو رێبازەش بەتەنهاو تەنها ئەرکی بەرچاوی خودی بەڕێز جەنابی سەرۆك بارزانی و سەرکردایەتی حەکیمی پارتی دیموکراتی کوردستان و کابینەی سێیەمی خزمەتگوزاری جەماوەری گەلەکەمان بووەو هیچ نکۆڵییەکی لێ ناکرێ.

لەراستیدا هەر چیەك بۆ بەڕێز جەنابی سەرۆك بارزانی و سەرکردایەتی حەکیمی پارتی دیموکراتی کوردستان و سێیەم کابینەی خزمەتگوزاری گەل بکرێت و بنوسرێت، ناگاتە چمکێکی قەوارەی ئەو خەبات و تێکۆشان و خەمخۆریەی (سەرۆك بارزانی) کە بۆ میللەتەکەی بەئەنجامی گەیاندووە، ئەمەو هەڵوێستی بەرزو نەگۆڕی جەنابی سەرۆك بارزانی بەرامبەر بە گەل و خاك ئایین و نیشتمانەکەی رۆژ لەدوای رۆژ تۆکمە ترو پتەو تر دەبێت و بەنەگۆڕی دەمێنێتەوە کەبەهیچ شێوازێك قەرەبوو ناکرێت، خوای گەورە تەمەن درێژیان بکات و سەرکەوتوبێت لەپێناوی چاکترکردنی باری ژیان و گوزەرانی هاوڵاتیانی موسڵمانی کورد بەمەبەستی زیاترو باشتر پەیرەوکردنی یاساو رێنماییە پیرۆزەکانی ئایینی ئیسلام و چەسپاندنی ئاشتی و تەبایی و برایەتی لەکوردستاندا.



# بەرەو خۆر

## هـانـا

بسم الله الرحمن الرحيم

**(فأعلم إنه لا إله إلا الله واستغفر لذنبك)**

(صدق الله العظيم)

فراوانـی (غـەیب) یـاخود پـەنهانی بـەو شـتە دەڵێـن کـەلێت دیار نـەبێت و نـەزانیت لەکوێـیە، (غـەیب) بـەواتا ئایینیەکەی بریتـیـیە لـەو زانینـەی کەتـەنیا لای خـودای پەروەردگارەوەیـەو تەنانـەت پێغەمبـەرانیش (درودی خوایـان لێ بێـت) دەرکیـان پـێ نـەکردووە، مرۆڤایـەتیش تـەنیا بەنیشـانەکانی توانیویـەتی لەدەرئـەنجام و تاقیکردنەوەکان بگات و ناراستەوخۆ بیریان لێ بکاتـەوەو لەکۆتاییشدا تەنیا هەر خوای مەزن خاوەن ئەو زانیاری و زانستەیە، ئەگەر سەدان ساڵیش بیری لێ بکەینەوە بەقەد تۆزقاڵێك ناتوانین بچینە بنج و بنەوانییەوە، (عالم الغیب والشهاده فتعالی عما یشرکون) (سوره المؤمنون/٩٣)، ئەو غەیبـەی ئێمـە باوەڕمـان پێیـەتی. خـوای مـەزن و فریشـتەکان و بوونەوەرەکانـە لەگـەڵ ڕۆژی دوایـی و هەڵسانەوەو زیندووبونـەوەو حەشـرکردن لـە گۆڕەپـان و دادگـای پـەروەردگارو بەهەشـت و دۆزەخ، بـەڵی کـاتێك جوبرەئیل لەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ی پرسی: پێم بڵێ بڕوایی (ایمان) چی یە؟ فەرمووی

(ان تؤمن بالله وملائکته وکتبه ورسله والیوم الاخروتؤمن بالقدر خیره وشره) (جامع الاحکام القران ج١)

بۆیە بڕواهێنـان بە(غـەیب)، سیفەتێکی لەپێشینەی موسڵمان و لەخواترسانە، پێغەمبەرو نێرراوانی خـواش( درودو ڕەزای خوایان لێ بێت) غـەیبیـان نـەزانیوە، ئەوەتا خـوای گـەورە لـەقورئانی پـیرۆزدا بـەزمانی پێغەمبـەر دەفەرموێ:

(ولوکنت أعلم الغیب لاستکثرت من الخیر ومامسنی السـوء ان أنـا الا نذیـر وبشیـر لقـوم یؤمنـون) (سـورة الانعام/٥٠).

کەواتـە بەبەڵگـەوە دەتوانـین بیسـەلمێنین کـەزانینی (غـەیب) تـەنیا لـەخوای مەزنەوەیـە، بـەر لەدۆزینـەوەی مایکرۆسکۆب، میکرۆب و ڤایرۆسـەکان نادیـارو غـەیب بوون، بەڵام زانایان توانیان گەردیلەو ووردترین بەشی مادده بدۆزنەوەو لێی بکۆڵنەوە، جاران کەس نەیدەزانی منداڵ چۆن لەسـکی دایکـی‌دا پـەیدا دەبێـت و جـۆری کۆرپەلەکەشیان نەدەزانی، بەڵام بەپێشکەوتنی زانست و عەقڵی مرۆڤ کە لەلایەن خواوە ڕۆشن دەبێتەوە، توانرا بەئامێری (سۆنار) ئەم لایەنە روون بکرێتەوە، بەڵام کێ هەیە بتوانێ دەرك بەوەبکات، ئەم کۆرپەلەیـە شێوەکەی چۆنـە؟ چـەند سـاڵ تەمەنیـەتی؟ چـۆن دەژی و کـەی دەمرێت؟ مرۆڤ هەرگیز لەژیانی‌دا ناتوانێت بگاتـە ئـەو حەقیقەتـەی کەخۆشـی و ناخۆشـی و دەوڵەمـەندی و هـەژاری و لـەش ساغی و نەخۆشـی لێك بداتـەوە بۆیـە غەیب وەك سیفەتێکی پاك و ناکی ئیلاهی تەنیا قابیل بە خودای پەروەردگارەو هەر ئەویش دەزانێت کـەدونیا کۆتایی دێت و کێ دوامەنزڵگای بەهەشتەو کێن ئەوانەی لەدۆزەخ میوان دەبن.

بۆیە لەسەر موسڵمانان پێویستە کەبەپێی ڕێنماییـە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبـەری مەزن (صلی الله علیه وسلم) لەو دونیایە بڕوانن، چاك لێی وردببنەوە، بزانن ئەو بوونەوەرە چۆن هاتۆتە کایەوە. بۆ گەیشـتنە بنـج و بنـاوانی هـەندێ لەراسـتییەکانیش. لەهەوڵ و تەقەللا بەردەوام بن، تاقی‌کردنەوە ئەنجام بدەن، هـەرگیز ئـەوەیان لـەبیرببێت ئـەم جیهانـەی دەوروبـەر بەهـەزاران هـەزار نهێنـی تێدایـە کـە عـەقڵی مـرۆڤ لەناستیاندا لاڵ و کوڵ و حەپەساو دەوەستێت. مرۆڤـی ژیرێش ئەو کەسـەیە کـە دوای هـەوەس و پڕوپاگـەندەی درۆو بـۆش نەکـەوێت، کەهـەندێ کـەس دایانهێنـاوە، گوایە لەو غەیب و نهێنیانـە دەگـەن و بـەپێی بیروباوەڕی پووچـی شـەیتان و دوور لەزانسـتی ئـایینی لێکـی دەدەنەوە، بۆیە موسڵمانی تەواوو پڕ لە بیروباوەڕ ئەوەیە کە بڕوای بەغـەیب و نهێنیـەکانی سروشـت و دەوروبـەر هەیەو هەمیشە دەزانێت کە (قل لایعلم من في السموات والارض الغیـب الا الله ومایشـعرون ایـان یبعثـون) النمـل /٦٥ بۆچی گوتراوە.







## پێشەوا قازی محەمەدو...

# بینایی کەسایەتیەکی ناوداری سیاسیو ئایینی

ئا: کاوە ئەحمەد بابەکر پشدەری

> مردنێك لەرێی نیشتمان و دین
> هەر دەیگرمەبەر بەخوێن و کۆشین
> ئاواش نەبایە، هەردەکەوتە دووم
> هیچ پەشیمان نیم لەوەی رابردووم
> (قازی)

### بەرایی

قازی نەمر.. لەلانکی مێژووی بنەماڵەیەکی ئایین پەروەرو ناوداری شاری مەهابادی ناوچەی موکری- کوردستانی خۆرهەلات، چاوی هەڵهانی و لەنیشتمانێکی سوتماك و خوێنیندا کەوتە پێ رۆچکەو زمانی پڕا هێشتا منال بوو گوێ بیستی زەنگی چەوسانەوەو زولم و زۆرو بەندیخانە بوو، هەربۆیە لەو جوغزە داخراوو نەگریسەی ژیانی گەلەکەیدا، چاوی بۆ ژیان کردەوەو گەورەبوو، ئەمەش وای لێ کرد: لەکلاو رۆژنەی هیواو ئاسۆیەکی روونەوە بڕوانیتە ژیان و داهاتوی چارەنوسی میللەتەکەی و لەبازنەی کێشەیەکی رەوای زەوت کراوەوە، بۆ مافی سەربەخۆیی و چارەنووسی ولاتە دابەش کراوەکەی بڕوانێ پێشەوای نەمر لە خاکێکدا چاوی هەڵێنا؛ زەوت کراو... لەت لەت... ئاوارەو سەرگەردان، لەبنەماڵەیەکیشدا گەورە بوو نیشتمانی و ئایین پەروەر بۆیە هەر لەسەرەتای منداڵیەوە، ئۆلیفەتی بەخەبات و ئازادی مرۆڤ و خاك و ئایین و مێژووی نەتەوەکەیەوە گرت و قوربانی بەگیان و جەستەی پیرۆزیداو سەری لەرێی رزگاری‌دا بۆ کردە دیاری و خەلات، بۆیە قازی نەمر.. هەرگیز لەیاد ناکرێ و کەسایەتی ئایین پەروەرانەشی لەبیر خەڵکی موسڵمانی کوردستان ناچێتەوە.



## قازی کێیە ؟

(قازی) ناوی (قازی محەمەد کوری قازی عەلی موکریانی)یەو لەساڵی (١٩٠١)دا لەشاری مەهابادو لەبنەماڵەیەکی ئایینی و نیشتمان پەروەردا لەدایك بووەو لەمناڵیەوە خراوەتە بەر حوجرەو خوێندنی فەقێیەتی.. ئەمەو لەلای قازی عەلی باوکیشی فێری خوێندنی قورئانی پیرۆزو نوسینی رێنوسی کوردیو فارسی و عەرەبی بووەو ئیجازەی مەلایەتی و قازییەتی لەموکریاندا وەرگرتووەو پاشان لەسەردەستی چەند زانایەکی ئایینی، ئیجازەی (عالم الدین) وەردەگرێو پاش مردنی باوکی دەکرێت بە (قازی مەهاباد)و پاشان دەبێتە بەرێوەبەری مەعاریف و سەرپەرشتی کاری سەرجەم قوتابخانەکانی زانستی ئەو ناوچەیە دەکات. پێشەوای نەمر لەو روانگەیەو لەئەنجامی مامەڵەکردنی لەگەڵ کاری ئیداری میریدا، فێری زمانەکانی بیانی وەك (عەرەبی، فارسی و تورکی و ئینگلیزی) دەبێت و لەچوار چێوەی کاری پەروەردەییدا خۆشەویستی وەرزش و وەرزشەوانان بووەو لەو سۆنگەیەشەوە هانی قوتابیانی لەبواری وەرزشدا، داوەو رۆڵی کاریگەری بینیوە لەپرۆسەی نەهێشتنی نەخوێندەواری لە دەڤەری موکریاندا.

**قازی محەمەد :**

**(بەناوی خودا، مەسەلەو رێبازی ئێمە دیارە، بۆیە سوێند بێت بەیەزدانی بێ هاوتا، خیانەت بەمیللەتەکەم نەکەمو ئەو رێگایەی دەیگرمەبەر بەری نادەم، تامردنیش بەرۆکم نەگرێ لەخەباتی سیاسیو ئایین پە روەرانەی خۆم، کۆڵ نەدەم...**

## قازیو رێبازی سیاسیو ئایینی

قازی محەمەدی نەمر لەساڵی (١٩٤٥)دا، کۆمەڵەی (ژێکاف)ی دامەزراندو لەساڵی (١٩٤٦)یشدا، وەك ئەندامێکی کارای دەستەی دامەزرێنەری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، دەوری بەرچاوی گێڕا لە دامەزراندنی ئەو حزبە بۆیە لەکۆنگرەی یەکەمی حزبدا بەسەرۆکی حزبی نابراو هەڵبژێردراو لەرۆژی ٢٢/١٢/١٩٤٦دا بانگی ئازادیو سەربەخۆیی کوردستانو کۆماری مهابادی راگەیاندو لەمەیدانی چوار چرای مەهابادا، سوێندی وەفاداری خواردو فەرمووی: (بەناوی خودا، مەسەلەو رێبازی ئێمە دیارە، بۆیە سوێند بێت بەیەزدانی بێ هاوتا، خیانەت بەمیللەتەکەم نەکەمو ئەو رێگایەی دەیگرمەبەر بەری نەدەم، تامردنیش بەرۆکم نەگرێ لەخەباتی سیاسیو ئایین پە روەرانەی خۆم، کۆڵ نەدەم... بژی کورد.. بژی کوردستان.. والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته)

قازی محەمەدی زیندوو ئەو بەڵێنەی بەمیللەتەکەی دابوو، هێنایە جێو لەمەیدانی چوار چرادا لەرۆژی ٣١/مارتی/١٩٤٧ لەسێدارە دراو گیانی کردە قوربانی خاكو نیشتمانیو دوا ماڵئاوایی لێکردین..

ئێمەش لەکۆتاییدا دەڵێین: گڵکۆتان گوڵو گۆڕتان پڕ نور ئەی پێشەوای مەزن.. هەزاران هەزار سڵاویش بۆ گیانی پاك و بەرزەفڕت.

* * * *
* * *
*





# مامۆستا مەلا محەمەدی عەلیاوەی (١٩١٩-١٩٨٥)

جرجیس ئیبراهیم خدر
ئیمامو خەتیبی مزگەوتی
قەلای هەولێر

پێش (١٣) ساڵ بەر لەئەمڕۆ دەستی مەرگ گەیشتە زانایایەکی بەناوبانگی قسە خۆشی شاری هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستانی عێراق کە مامۆستا مەلا محەمەدی عەلیاوەی بوو.. کەئەستێرەیەکی دەرەوشاوەبوو بە ئاسمانی شاری هەولێری خۆڕاگر هەولێری شێخ ابوبکر هەرشەمین شێخ مستەفاو مەلا فەندیو مامۆستا ملا صالح کۆزەپانکەییو قازی رەشادو، شێخ عومەری بالیسانیو مامۆستا مەلا ابوبکری کۆییو مامۆستا مەلا فائزو مامۆستا ملا عبدالرحمانی هەمزە کۆریو سەدان زانایی تر بوو.

بەڵێ بەر لە (١٣) ساڵ دەستی مەرگ گەیشتە ئەم زانایەو بلیمەتەکە هەردەم خەڵك قسەو نوکتە خۆشەکانی ئەگێڕنەوە .

خوالێخۆشبوو لەساڵی (١٩١٩) لەگوندی گردعازەبانی سەر بەناوچەی قوشتپە لەبنەماڵەیەکی ئیمانداری هەژار چاوی بەژیانی پڕ ئێشو ئازاری نەتەوەکەی هەڵهێناوە، کە بەرەگەز بنەماڵەکەیان ئەگەڕێتەوە سەر بەگوندی (عەلیاوە)ی نزیك بەگوندی گردعازەبان بۆیە هەر بە (مەلا محمدی علیاوەیی) ناسراوە، سەر بەتیرەی (سنجاوی)یە .

مامۆستا مەلا محمد لەبەر هەژاری خێزانەکەی خەریکی کار بووە بەمناڵی بەلام زۆری حەزی لەخوێندن بووە بۆیە رۆژێك بیری خوێندن وای لێ ئەکات کە دەست لەکار کردن هەڵبگرێو رابکات لەکارەکەی بێ ئاگاداری ماڵەوەیان بۆ گوندی (شیوەپیران)ی سەر بەشاری حاجی قادری ئەمر شاری کۆیەی دڵگیر کە لەوێ ئەچێتە لای (فەقێ کەریم قادر) کە ئەویش خەڵکی گوندی عەلیاوەبوو لەم گوندە ئەی خوێند یەکسەر دەست ئەکات بەخوێندنی کتابی (عەوامل جرجانی) لای مامۆستا مەلا ئەحمەد دوای خوێندن لەلای چەند مامۆستایەکی بەناوبانگی کوردستانی خوارو رۆژهەلات وەکو (مامۆستا مەلا خلیل مخلص)و مامۆستا مەلا ئەحمەدی رەش، مامۆستا مەلا محەمەدی شێروانیو مامۆستا مەلا مەرحوم کۆیی، مامۆستا مەلا ئیسماعیلو مامۆستا مەلا شەریف زادە)و چەندان زانای بەناوبانگی تر شارو گوندەکانی کوردستانتا لەساڵی ١٩٤٩ لای زانای بەناوبانگ مامۆستا (مەلا عەبدولکەریم خەیلانی ) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، پاشان دەستی کردە مەلایەتی دەرس وتنەوە لەگوندەکانی کوردستان وەکو گوندی (پەنجا عەلی) لەشاری گرو بلێسەو شاری بابە گورگوڕی کوردستان شاری کەرکوکی بریندار، گوندی گرد قۆشنەی سەر بەناحیەی قەراج، مزگەوتی گەورە لەناو شاری هەولێرو گوندی گرد عازەبانم...هتد هەمیشە ئەو



مزگەوتانەی ئەمی تیابووە بۆتە قوتابخانەو چەندەها فەقێ دەرسیان تیاخوێندوە.

لەساڵی (١٩٦٠) لە بەر دەست کورتی و بێ دەرامەتی بۆتە مامۆستای قوتابخانەی میری و وانەی ڕێزمانی کوردی و عەرەبی تیا وتۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەر کۆڵی نەداوە لە مەلایەتی و دەرس وتنەوە.

بەفەقێیان ماڵەکەی خۆیی و مزگەوتەکانی نزیک ماڵی بووبوە قوتابخانە بۆی.

مامۆستا مەلا محەمەد تەمەنی خۆی قەد بەفیڕۆ نەداوە هەر خەریک بوو بەخزمەت کردنی ئایینی پاکی ئیسلام وە هەر دەم خۆشەویستی خەڵک بووە دەم بەپێکەنین و دڵ فراوان بووە، هەر مەجلیسێك ئەدی تیا بووبێ هەردەم بەقسەی خۆش و نوکتە تەواو ئەبوو.

خوالێخۆشبوو لەکاتی سەرکەوتنی کۆماری مهاباد چۆتە مهاباد تا رووخانی کۆمارەکە.. پاشان گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراق. دووجار میوانی شێخ محمودی نەمر بووەو شەو لای ماوەتەوە.

مامۆستا مەلا محمد لەدوای خۆیدا چەند دەست خەتێکی نایابی بەجێهێشتوو کە دەستخەتی وای تیایە کەزیاتر لە (٤٠) ساڵ خەریکی بووە وەدەستێکی با لا ی هەبووە لەزانینی (زانستی فراسەو فەلەکیات) وەهەروەها حساب گرەکی چاك بووە لەبارەی وەزعی سروشتی ساڵ لەم بارەیەوە دەست نووسێکی بەجێهێشتوە کەباسی سروشتی ساڵ دەکات و هەروەها دابەش کردنی ساڵ بەهەفتەو ناوەکانی هەفتەو سروشتیان و چۆنیەتی پێکهاتنی زەوی و ئاسمان.

وە لەمەیدانی مێژووشەوە کۆڵی نەداوە دەست نووسێکی هەیە باسی مێژووی ژیان و وەفات کردنی زانا ناودارەکانی کورد ئەکات وە رووداوەکانی سروشتی و عە شائیری کەبەسەر ناوچەی کوردستان داهاتووە، وە لەبارەی ژیان و گوزەرانی (فەقێ) دەست نوسێکی نایابی هەیە کەباسی ژیان و قۆناغەکانی و مادەکانی خوێندنی (فەقێ) ئەکات تاوەکو ئیجازە لای مامۆستایەك وەرئەگرێ مزگەوت و مامۆستاکان شایەدی ئەوەن کەمامۆستامەلا محەمەد چ دەورێکی هەبووە لەسازدان و ڕێکخستنی ئاهەنگی ئیجازە دان کەهەر خۆی سەرپەرشتی ئەکردو دەوری تیائەدی ئەبووە جێگای سەرسوورمانی خەڵکەکە لەبلیمەتی و هەڵسوڕانی ئاهەنگەکە کەچەند رۆژێکی ئەخایاند.

خوالێخۆشبوو لەبارەی شعریش دوانەکەوتەوە دیوانێکی شعری هەیە کەباس لەئێش و ئازاری گەلەکەی ئەکات لەساڵی چل و پەنجاکان.

خوالێخۆشبوو بەمەش نەوەستاوە چەند دەست خەتێکی بەزمانی عەرەبی هەیە لەبارەی ڕێزمان و شەرع.

وەلەرووی قسەی خۆش و نوکتەوە دەست نووسێکی گەورەی هەیە کە لەچەند بەرگ پێکهاتووە.. کەهەندێکیان رووداوی راستەقینەن بەسەرەخۆی هاتووە لەژیانی فەقێ و مەلایەتی.. کەئەبێتە گەنجینەیەك بۆ شەو چەرەی کوردەواری، لەگەڵ چەند دەستنووسی تر، بەڵام بەداخەوە تاوەکو ئێستا دەست نووسەکانی ڕۆناکیان نەدیوە، تەنها قسە خۆشەکانی نە بێ کەهاوڕێ و دۆستە بەوە فاکانی لەناو کۆڕو مەجلیسەکان ئەیگێڕنەوە.

وەلەدوای خۆیدا کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی جێهێشتووە هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی ئەم زانا بیلمەتە بێ کە لەخوای گەورە داواکارین جێگای بەهەشت بێ.

* * *

*



# هۆکارەکانی جیاوازی بۆچوونی زانایان لەفقهدا

مەلا عەبدولەتیف بامۆکی

**دەسپێك**: ئەم باسە زۆر دەمێکە زانایانی شەرع زان و یاساناسی سەرگەرم کردووە، ئەگەر ڕۆژانە لەخزمەت زانایەکی ئایینیدا سەرنج و تێبینی بکەین، یان لەکتێبێکی شەرع دا سەرباسێك بخوێنینەوە هەست دەکەین جیاوازییەکی یەکجار زۆر هەیە لەراوبۆچوونی زانایانی فقهی ئیسلامی هەتا دەگاتە عەسری پەیام و سروش و کاتی ژیانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەندێ جیاوازی لەراوبۆچووندا هەبووە، بەڵام رابەرەو پێشەوا لەرێگەی سروش و قورئانەوە چارەی کردووە و نەك هەر قەدەغەی نەکردووە، بەڵکو راست و رەوان فەرموویەتی ئەگەر - تێکۆشەر- مجتهد- هەڵەش بکات لەبۆچوونیدا ئەجرو پاداشتی هەیە، خوداو پێغەمبەر پێیان ناخۆش نییە لەگەڵ ئەوەش خودای پەروەردگار دەفەرموێ ﴿اليوم اكملت لكم دينكم واتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الاسلام ديناً)مائدة-٣- وە یغەمبەری خودا بناغەی پتەوی شەریعەتی داناوەو گشت بنەما و ئوصول و مەقاصیدی جیاکردۆتەوە لەلق و پۆپ و فەرعەکان و ئوصولی عەقیدەدا نابێ جیاوازی هەبێ‌و هەموو موسڵمان یەك راوبۆچوونیان هەیە، ئەوەش ئەوەیە کە خودا خۆی داناوەو نیشانی داوین، بەڵام بۆ لق و لك و خەڵفی بچووك رێگەی داوە کە فرمان لەزاناو دانا وەربگرین (فأسئلوا اهل الذكر ان كنتم لاتعلمون)٤٣-النحل، چونکە ئەو وەرگرتن و تێگەیشتنە صیفەتی پێغەمبەرەو زاناش میراتگری جەنابی رابەرە، ئایەتی ﴿وانزلنا اليك الذكر لتبين للناس ما نزل إليهم ولعلهم يتفكرون)النحل٤٤، ئاماژەیەو رێنماییە کە هەوڵ بدرێ بەڵگەی زانستی شەرعی لەسەر فرمانەکمان دیاری بکرێ‌و لەرێگەی (تفکّر)ەوە یارو یاوەرو هەواڵەکانی پێغەمبەر بەراستی ئەستێرەی گەشی پرشنگداری اجتهاد و مۆمی داگیرساوی بیرکردنەوەو ژیری بەکارهێنان بوون، لەپاش ئەوان شوێن کەوتوان و مجتهدە پایەبەرزو بلیمەت و بەتواناکان بەزاتی ئەوان و شوێن هەڵگرتنی رێبازی ئەان خۆیان هاوێشتە دەریای فقەو زانستی شەرع و بنەماکانی بۆچوونی رێبازی تایبەتەوە بەبێ ئەوەی کە بەخەڵك بڵێن شوێنمان بکەون و هەموو کات دەیان فەرموو ئەگەر فەرموودەی راست هەبێ ئەوە رێبازی ئێمەیەو بۆچوونی ئێمە بۆ خۆمانە و لەم رێگەوە گشت فەرمانە شەرعیەکان و هۆکارەکانیان دیاریکردووە کە بەبوونی فەرمان هەیەو بەنەبوونی نییەو شێوازی حوکم دیاری کراوە، ئا لێرەدا جیاوازی پەیدا دەبێ کە جیاوازی لەئاییندا نییە، جگە لەوەش خودای پەروەردگار خۆی جیاوازی مرۆڤی کردووە لەرووی زمان و رەگەزو رەنگ و ژینگەو بەنیشانەی گرنگی خودایی خۆی داناوە ﴿ومن آياته خلق السموات والأرض واختلاف السنتكم والوانكم ان في ذلك لآيات للعالمين﴾الروم٢٢، چاك سەرنج بدە وشەی پیرۆزی قورئان ﴿للعالمين﴾ کە چەند بەهێزو



هێمایە کە زانا مافی بۆچوونی هەیەو بووە کە ئەوەش جیاوازی زانین و هێزو بلیمەتیو فام و ژیری و تواناو هێزی خۆپسك و خداداو رۆشنبیری و پەروەردەو فێرکردنی تێدایەو دەگەرێتەوە، کەواتە جیاوازی خۆی لەخۆیدا کارێکی خۆداییو سروشتییەو لەگەڵ مرۆڤدا دروست بووەو لەگەڵ هەموو قۆناغ و سوڕی ژیانیدا هاتووە و دیاردەی مرۆڤە وەك مرۆڤ و بوونەوەر ﴿ولو شاء ربك لجعل الناس امة واحدة ولايزالون مختلفين الا من رحم ربك ولذلك خلقهم﴾الأنعام-١٥٩، کەواتە خوای دروستکەری بوونەوەر نایەوێ یەك نەتەوە یەك عورف دابو نەریت فەرمانڕەوای هەموو بێت لەگێتیدا.

جیاوازی هەیە لەرووی کەسایەتیو خۆیەتیو ژینگەو خێزان و زمان و ئالوودەییو زیرەکیو هەستو سۆزەوی، لەبەر ئەوە جێگەی سەرسوڕمان نییە ئەگەر جیاوازی هەبێت لەراوبۆچوون و هێزی زانایانداو ئەگەر بوو شتێکی ئاساییو یاساییەو جیاوازی زانایانیش بەشێکە لەگشتیەکە، جگە لەوەش نەبێ ئاگاداری ئەوە بین کە خودی جیاوازی هۆکاری گەیشتنە بەچاکترین رێگەی بەختەوەریو جوانکاریو خۆشنودی پەروەردگار، ئەگەر جیاوازی نەبوایە مرۆڤ نەدەگەیشتە ئەم پلەیە لەزانستاو جیاوازی لەمرۆڤ نەدەبوو لەگەڵ بوونەوەرەکانی تر وەك پێغەمبەرمان دەفەموێ: (واختلاف امتي رحمة) تەبەرانی ریوابەتی کردووەو زانایان لەمانای فەرمووەدەکە فەرموویانە جیاوازی ئاسان کردنە بۆ خەڵك کە شەرع بەچەند رێبازێك نەهاتووە، بەڵام ماوە هەیە کەهەندێ جیاوازی هەبێت، هەروەها نیشانەی بەرفراوانیو پان و بەرینی شەرعی ئیسلامە بۆ ئەوەی کاری خەڵکی رانەوەستێو بەرتەسك و تەنگەلان نەبێ و خەڵك رێگەی سەخت و دژوار تووش نەبێ. جیاوازی فقە بەخشینە، نیعمەتە تەنها میللەتی موسلمان بەهرەوەرە، حەز دەکەم تەنها یەك نموونە نیشان بدەم دەست نوێژ لەکوردستان بەرێبازی پێشەوا شافعی سووك و ئاسان ترە هەتا رێبازی ئیمامی ئەعظەم رەزاو رەحمەتی خوایان لەسەر بێ، بەڵام بۆ شارو لادێ پێچەوانە دەبێتەوە یان لەکاتی حەجدا رێبازی ئەبوحەنیفە ئاسان و سووکە.

بەڵێ راستە جیاوازی ناساز ناپەسەند هەیە ئەوەش بۆ ئارەزووکارییو هەواو هەوەس و سواری حەز بوون و هەڵبژاردنی سووك و ئاسان لەهەموو رایەکان، چونکە ئەو کاتە وەك چەند ئاینێك خۆی دەنوێنێ ﴿ولاتکونوا کالذين تفرقوا واختلفوا من بعد ما جاءهم البينات﴾ خودای پەروەردگار جیاوازی لەراوبۆچوونی ناپەسەند کردووە ئەگەر دەقێکی قورئانی یان فەرموودە هەبێو پێچەوانەی کار بکەین و خۆماندی بکەین بۆ جیاوازی کە ئەوەش ئاشکرایە لەگەڵ مەقاصیدی شەریعەدا ناگونجێ لەبەرئەوە بەخراپ نیشان دراوە، بەڵام جیاوازی نێوان رێبازە رەسەن و پەسەندو شایستەکان بەبەڵگەو دەلیلی عەقلیو نەقلی بەو موسڵمان هەردوو رێبازەکەیان رێبازەکانی لەبەرچاوەو دەتوانێ خۆی سەرپشك بێت و لایەکیان هەڵبژێرێ ئەویش نەوەك بەشێوازی (تلفيق) کە بەواتای تێکەڵو پێکەڵو هەڵبژاردن وەك بژارکردنی بۆچوونەکان.

کەواتە هۆکاری جیاوازی نێوان زانایان لەزانستەوە هاتووەو بەوردبوونەوە لەزاراوەی راستی (حقيقة) لادان (مجان) تاك و کۆ (مفرد وجمع) گشتیو تایبەت، رەهاو پەیوەند (عام و خاص و مطلق و مقيد)و پلەی گەیشتنی فەرموودە یان بۆچوون لەشوێنێك دەق نەبێ یان هەبێ هەموار کرابێ (نسخ) یان کارەکە بەر حەڵاڵی و بەرفراوانی بکەوێو گەڵێ شتی کە ئەتوانین لەسێ بەشدا جێگەیان بکەینەوە، یەکەم پەیوەندی



بنەماكان لەگەڵ زمانەوانیو وشەسازی عەرەبی، دووەم ڕەفتار لەگەڵ فەرمووده لەهەموو ڕوویەكەوە، سێیەم هەوڵو كۆشش و اجتهاد لەو شوێنەی كە دەقی تێدا نییە، ئەمانە هۆكاری جیاوازیەو لەزانایەكەوە بۆ زانایاكی تر دروست دەبێو زۆر ئاسایییە، ئیبن ڕوشد لەكتێبی (بداية المجتهد ونهاية المقتصد) دەفەرموێ: هۆی جیاوازی شەشە. یەكەم وشەی شەرعی یان گشتییەو مەبەست تایبەتە یان پێچەوانە یان ڕاستەوانە. دووەم هاوبەشی لەئاخاوتن و لەماناو مەبەستدا، سێیەم جیاوازی لەخوێندنەوە واتە شیكردنەوەو ئیعراب، چوارەم حەقیقەت و مەجاز، پێنجەم ڕەهاو پەیوەند شەشەم ناكۆكی بەڵگە لەنێو خۆیانداو دژ بەیەك بوون، ئیبن تەیمیمە دەڵێ هۆكار سێیە یەكەم زانا بڕوای وایە ئەم فەرمووده لەپێغەمبەر نەهاتووە. و ئەگەر هاتووە لاوازە، دووەم ئەم بەڵگەیە بۆ ئەم داوایە دەست نادات و ناشێ، سێیەم ئەم فرمانە نەسخ بووە (رفع الملام عن لائحة الأعلام)ل٤-١٥.

ئێمەش لەكۆششەنیكای كوردەوەو بەهەوڵو كۆششی زانای كورد ئەم بارە ڕوون دەكەینەوە كە زانای كورد هەمیشە هەوڵیان داوە جیاوازی لەچوارچێوەی نێوان زاناو زانا دەرنەچێت بگاتە كۆڵان و شەقام و ڕەشایی خەڵكی ئاشارەزاو لەرێگەی فەتواو نامەنووسینەوە چارەسەری ناكۆكیو جیاوازی ڕاوبۆچوونیان كردوە، لەم دواییەدا بەڕێزو پایەبەرزو مامۆستاو شارەزا لەفقەو یاسادا دكتۆر مستەفا زەڵمی ئەو زەحمەتەی ئاسان كردووەو ئەم ڕێگەی ئاوەڵا كردووەو زۆر چاك ڕێگەی تەخت كردووە بۆ گەیشتن بەم ئامانجانەی خوارەوە، یەكەم هەوڵی بێ ماندوو بوون بدرێ كەلێكۆڵینەوەی ئوصول و فهەكەی پێكەوە گرێ بدرێ، دووەم نزیك كردنەوەی گشت ڕاوبۆچوونەكان لەنێوان ڕێبازەكان و خودی فیقهی ئیسلامی، سێیەم دانانی فیقهی ئیسلامی بەشێوازێكی جوان و قەشەنگ و بێ گرێ. چوارەم بنبڕكردنی گومانی هەندێ نەفس لاوازو نەخوێندەوار، پێنجەم نرخاندن و هەڵسەنگاندنی گشت بۆچوونەكان بەشێوەی زانستیو فراوان.

جا خوا یاربێو یارمەتی بدات ئێمەش هەوڵ دەدەین لەتوێژینەوەی هۆكارەكان نێوانی ناكۆك و دژەكان كەم بكەینەوەو لەرێگەی بۆچوونی سەردەم و هاوچەرخ و پاراستنی كەلەپوورو پاشماوەی پرشنگ داری گشت زانایانی كوردەوە و هەوڵ دەدەین كە سنوورێك بۆ شێرگێری و دەمارگیریو پەرگیریو لاگیری و خۆپەسەندی و طایفەگەری كە بێگومان هەندێكیان سەرچاوەیان لە كەم فامیو دنیا پەرەستیو نان بەدین خواردنەوە پەیدا بووە.

وشەی (فقه) بەكوردی مانای تێگەیشتنیو حاڵی بوون و حازر جواب و ئامادە هاتووە لەزاراوەی زانستی شەرعیدا لەسەر یەك مەبەست ڕانەوەستاو، چونكە لەسەردەمی پێغەمبەردا بەمانای شارەزایە لەقورئان وفەرموودەدا پێشەوا ئەبوحەنیفە دەفەرموێ (فقه خۆناسینە كام دەشێ كام ناشێ؟) و پێشەوا مالك دەفەرموێ (تیشك ڕووناكییە لەناو دڵی مرۆڤ دایەو ڕێگەی ئەو دنیای پێ شارەزا دەبین، بەڵام ئێستا فقه زانستێكە كە فرمانەكانی شەرعی پێ دەزانین وەك زانای ئوصول پێناسەی دەكەن (العلم بالأحكام الشرعيه العلميه المكتسبه من ادلتها التفصيليه) كە ئەوەش یان عەقائدە یان ئەخلاقە یان عبادەتە، ئێمە لەدرێژەی ئەم باسە ئەوە ڕوون دەكەینەوە كەهەندێ لەنەزانین و نەفامییەوە دەڵێن خواو پێغەمبەرو قورئان یەكە، ئەم هەموو جیاوازییە بۆچییە... خوا یارو هاوكار بێت.



لێکۆڵینەوەی زانستی ئیسلامی

# ئابووری لەقورئانی پیرۆزدا

[الذين يأكلون الربوا لايقومون الاكما يقوم الذي يتخبطه الشيطان من المس ذلك بأنهم قالوا إنما البيع مثل الربوا وأحل ا لله البيع وحرم الربوا].

ئەگەر بێتو سەرەنج بدەینە بەشێك لەو ئایەتەی سەرەوە کەدەفەرمووێ ﴿انما مثل الربوا﴾ لەراستیدا خوای گەورەو میهرەبان دەیەوێ دڵنیامان بکات لەوەی کە ریباو فرۆشتن دووشتی جیاوازو دژ بەیەکن ریبا واتە شتێك زیادە تر لەشتە ئەصلەکەدا، شتەکەش پارەیە واتە ئەو رێککەوتنەی نێوان دوو کەس بەمەرجێ لایەنی یەکەم برێك پارە بداتە لایەنی دووەم بەمەبەستی کارپێکردنی یان بۆ هەر پێویستیەکی تری لایەنی دووەم.. پاشان لایەنی دووەم پارەکە وەکو (قەرز) نایگەرێنێتەوە. بەڵکو لەبری پارەکە زیاتر دەگەرێنێتەوە کە ئەو برە پارەیەش پێشتر هەردوولا لەسەری رێککەوتن. ئەم جۆرە مامەڵەیە هەر لەسەردەمی جاهیلیەکانەوە کاری پێکراوەو تا ئێستاش لەلایەن هەندێ کەسی خوانەناس و تەڵەکەباز کاری پێ دەکرێت، زۆرجاریش کەلایەنی دووەم ئەو برە پارە زیادەی نابێ بیگەرێنێتەوە ئەوا دەبێتە هۆی شەڕوبەکارهێنانی توندو تیژی لەنێوان خۆیاندا.

کەواتە ئەو شێوە مامەڵەیە جێگای بروانیە، خوای گەورە لەهەر لەهەمان سورەتی (البقرە) هەروەکو لەهەمان شوێندا باسی پەیمان بەستن و ریباو مامەڵەی کرین و فرۆشتنی روونکردۆتەوە بەمەبەستی پارێزکردنی ماڵ و موڵکی ئەوانەی خوێندەواریان نییەو هەروەها باسی هەموو جۆرە پەیمانێکی کردووە. کەواتە لێرە پەیمان بەستن هەیە لەنێوان ئەو کەسەی پارە بەقەرز دەداتە کەسێکی تر، ئەو پەیمانە پێویستە ئاشکراو سنوور داربێت بۆ کاتێکی دەستنیشان کراو بەمەرجێ قەرز دەر پارەکەی خۆی بەبێ زیادە وەرگرێتەوەو قازانجی نەبێت لەو برە پارەیەی کەبەقەرز داویەتی، بەڵام هەندێ کەس ئەگەر ئەو پارەیەی کەهەیەتی بیداتە خەڵکی بەمەبەستی سوود لێوەرگرتنی بۆ خۆی لەپەنای ئەو کارە هەندێ پارەی تر پەیدا بکا ئەوا ئایینی ئیسلام دژیەتی چونکە پارە زیادەکە بەبێ بەرامبەر وەردەگرێ ، ئەو جۆرە مامەڵەیە پێی دەڵێن ریبا.

خوای گەورە لەسورەتی (البقرە)دا دەفەرمووێ ﴿يأيها الذين امنوا اتقوا ا لله وذروا مابقي من الربوا ان كنتم مؤمنين) هەروەها دەفەرمووێ فأن: لم تفعلوا فاذنوا بحرب من ا لله ورسوله وان تبتم فلكم رؤوس اموالكم لاتظلمون ولاتظلمون﴾ هەروەها دەفەرمووێ ﴿وان كان ذو عسرة فنظرة لاميسرة وان تصدقوا خير لكم ان كنتم تعلمون﴾.

ئەو چەند ئایەتەی سەرەوە سەبارەت بەریبا هاتوون، لەئایەتی یەکەمدا زۆر بەروون و ئاشکرایی باسی حەرامی ریبا دەکات هەروەك دەفەرمووێ ﴿فلكم رؤوس اموالكم لاتظلمون ولاتظلمون﴾ چونکە ریبا مانای زوڵم کردنی کەسێکی دەوڵەمەندە لەکەسێکی دەستکورت و هەژار... ئایینی ئیسلام داوا لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەکات کە کۆمەڵگەیەکی هاوکارو چاکە کردن بن لەنێوان خۆیاندا تەنانەت بێ بەرامبەر هەروەك لەم ئایەتەدا دەفەرمووێ ﴿وان كان ذو عسرة فنظرة لاميسرة﴾ واتە چاوەڕێ بکەن تا پارەکەتان وەردەگرنەوە. پاشان دەفەرمووێ ﴿وان تصدقوا خير لكم﴾ واتە دەتوانن لەو قەرزە خۆش بن و بەو شێوەیە خۆشەویستی و وەفایی لەنێوانتانا زیاتر دەبێ، بەڵام ئەگەر پارەکە بکەوێتە قاڵبی ریباوە ئەوا سوودی دووقات و زیاتر دەبێ، بەو شێوەیە دەست کورت و کەم دەرامەتەکان رقیان لە دەوڵەمەندەکان دەبێتەوە.

بۆیە ئایینی ئیسلام سوورە لەسەر دوور کەوتنەوە لەریبا لەژیانی رۆژانەماندا، بۆیە زەکات و بەخشینەوەو چاکەو خێری بۆ کەسانی دوورو نزیکی دەوڵەمەندەکان دارێژتووە، تا خۆشەویستی و ئاسایش و دڵنیابوون لەماڵ و موڵك لەنێوان خەڵکیدا بڵاوببێتەوە.

بەڵام مامەڵەی کرین و فرۆشتن جیاوازیەکی زۆری هەیە لەگەڵ ریبا چونکە کرین و فرۆشتن بازرگانی کردنە، وەك کەسێك هەندێ کەل و پەل دەکرێ و پاشان لەبازار





دەیفرۆشێتەوە کە زۆرجاران نرخی ئەو کەڵو پەلە یا دادەبەزێ یا بەرز دەبێتەوە... ئەمەش مانای ئەوەیە کابرای بازرگان بێپێشبینی قازانج، مامەڵەی کڕین و فرۆشتن دەکات.

وشەی ریبا مانای (نرخی سوود) دەگەیەنێ بەواتایەکی تر بڵێین (نرخ) نەك (دەسکەوت) واتە پێبژاردنی پارە لەو کەسەی کەوەری گرتووە نەك ئەو دەستکەوتەی لەکڕین و فرۆشتندا بەدەستی کەوتووە، بۆیە ئایینی ئیسلام کۆتایی بەو مەسەلەیە هێناوەو پارەی هەر بەپارە داناوەو ئەرکی سەرەکیشی ئاسانکردنی مامەڵەکردنە لەنێوان خەڵکیدا، زانایانی مێژووی ئابووری دەڵێن بەکارهێنانی پارە لەئەنجامی ئاڵۆزی و زۆر مامەڵە کردن هاتۆتە کایەوە. هەروەك چۆن کاتێ دەچینە لای میوە فرۆشێك ئێمە رازین بەوەی کە بڕێك پارە بدەین لەبری سێو، ئەویش رازیە کەسێوەکەمان پێ بدات، کەواتە ئاکرێ پارە بە کەڵو پەل وەکو سێوو تەماتەو نان تەماشابکرێت بەڵکو پارە هەر پارەیەو لەرێگای مامەڵەی کڕین و فرۆشتن خەڵکی دەستی دەکەوێت.

کەواتە بێ دوو دڵی ریبا لەهەموو کاتێکدا حەرام کراوە، جا ئەو ریبایەکەم بێ یا زۆر، بەڵام کڕین و فرۆشتن بەپێچەوانەوە حەڵاڵ کراوە. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ ﴿احل الله البيع وحرم الربوا﴾.

بەکورتی ئایینی ئیسلام سنووری بۆ مامەڵەکردن و ریبا داناوە تاوەکو هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی رزگاریان بێ لەچەوسانەوەو خەڵەتاندن...

بەوهیوایەین خوای گەورە پشت و پەنای هەموو لایەکمان بێ بۆ خۆ دوور خستنەوەمان لەو جۆرە مامەڵە حەرامەو کاتێ ئەوە هاتووە پشتی یەك بگرین و یارمەتی برا موسڵمانە کەم دەرامەتەکانمان بدەین لەپێناو زیاتر گەشاوە تر کردنی ئایینە پیرۆزەکەمان.

**سەرچاوەکان:**


* القرآن الكريم
* نظرية الحق في الفقه الاسلامية.
* الاثراء على حساب الغير.
* النظرية العامة للموجبات والعقود في الشريعة الاسلامية.


# چەند تێبینی یەك لەپەیڕەوكردنی خشتەی لەبەركردنی قورئانی پیرۆز

کەلسوم حەسەن رەسوڵ

ئەوەی لەراستە شەقام بڕوات و هەنگاوی پڕ لە حیکمەت و نەخشدار بنوێنێت ئەوا دەگات بەچڵەپۆپەی هیواو مەبەستی خۆی، بەڵگە نەویستە کەهەر کارێك و هەر هەوڵدانێك و هەر رەنج و تێکۆشانێك ئەگەر هاتوو نەخشەو پرۆژەیەکی دارێژراوی نەبوو ئەوا دەرئەنجامێکی باش و پڕ لەسوودی نابێت، بۆیە ئەگەر بمانەوێ قورئان لەبەر بکەین پێش ئەوەی راستەو خۆ خۆمان خەریك بکەین واشیاوە کەچاوێك بەو تێ بینی و وردە سەرنجانە دابخشێنین بۆ ئەوەی فێری چۆنیەتی لەبەرکردنێکی زانستیانە ببین و تێ بینی یەکانیش ئەمانەن:

١) پێش ئەوەی دەست کەی بەلەبەرکردنی قورئان، هەوڵدە کەوا بتوانیت ئەو بەشەی کە دات ناوە بۆ لەبەرکردن بەتەواوترین شێوەو جوانترین خوێندنەوە بیخوێنێتەوە بۆ ئەوەی وێنەی پیتەکان و جەمکەکان لەعەقڵتا فۆتۆکۆپی بێت.

٢) هەڵبژاردنی کاتی گونجاو بۆ لەبەرکردنی قورئان وەکو کاتی دوای نوێژی بەیانی، لەبەر ئەوەی ئەم ساتە خۆی لەخۆیدا پڕە لەحاڵەتی زیندەگی (حیویە)و لاپەرەکانی عەقڵیش لەو سالەت و دەمەدا هیچیان لێ تۆمار نەکراوە، واتە لاپەرەکانی عەقڵ ئەوسات بێگەردن و خانەکانی مێشکیش ئامادەباشی ئەوەیان تێدایە کەوا ئایەتە پیرۆزەکانی خوای پەروەردگاری هەموو بوونەوەر

بەشـێوەیەکی رەوان وەربگرێـت، بێجگـە لـەکاتی بـەیانی دەکـرێ هـەرکاتێکی تـر مرۆڤـی موسـڵمان وەری بگرێ بەمەرجێك ئەگەر هاتوو لەدونیایـەکی هێمـن و بـێ دەنـگ و کپ و دوور لەژاوە ژاوبوو هـەروەها ئەو کاتەش سەرگەم نەبێ بەژیانی دونیا ئەوسات دەرگا لەسەر پشتە بـۆ ئـەوەی دابنیشـیت و قورئـان لەبەرکەیت.

٣) ئـەو ئایەتانـەی کـە لەبـەرت کـردووە لەخشـتەی ئـەو رۆژەدا هەوڵ دەیت لەپێنج نوێژەکانی ئەو رۆژە بیلێتـەوەو لەگـەڵ کۆشـش کـردن و وریـابوون لـەوەی کـەوا حوکمەکانی تـەجوید بەپێی توانـا پەیرەو بکەیت.

٤) ئـەو کاتـەی کـە بـۆ لەبـەر کردنت داناوە لەنەخشـەی خۆتـدا هـەوڵدە هەر چۆنێك بێت لێی بـێ ئاگا نەبیت، وەهەروەها کەمو زیادو لاوازکـردن و درێژکردنـەوەی ئـەو کاتـە کەبـەرژەوەندی تـۆدا نییـەو هـــەروەها لەوانەیـــە لـــەبواری دەروونـــیدا مەعنەوییـــەتت دا برووخێنن و ساردت بکەنەوە.

٥) پێویستە ئـەوە لەبیرنەکـەیت کـەوا رۆژانـە بـەپێی توانـا قورئـان بخوێنێتـەوە ئەگـەر بـۆت بکـرێ لـەجوزئێك کـەمتر نـەبێ، چونکـە بـەردەوام خوێندنـەوەی قورئـان دەبێتە رێگا خۆش کەرێك بۆ ئەوەی تۆ لات سانابێ قورئـان لەبـەرکردن لەگـەڵ ئەمەشـدا گـوێو تـەوژمو گەرمی جۆرە پەرۆش بوونێکت پـێ ئەبەخشی لەدیوی ناختدا.

٦) ئەو سوورەتانە بخوێنیتـەوە کەوا بەرزیو پایەکەیان باسـکراوە لەهـەندێك فـەرموودەی صحیـح دا وەسات و کاتەکەشیان بزانی وەکو خوێندنـەوەی سـوورەتی (الکهـف) لەرۆژی هەینیو هـەروەها سورەتی (الدخان) لەشەوەکەیدا وەهـەروەها سـوورەتی (الملـك) دوای نوێـژی عیشـاء لەهـــەموو رۆژێکـــدا، وە لەبەرزیی خوێندنی ئەم سوورەتانە سوودو خێرێکی بەبەرەکـەت یـان پێ دەگات وەخوای گەورەش بۆیـان سووك و سانا دەکات.

٧) دەبێ ئـەو بەڵێنـە بـەردەوام لەناخی خۆتـدا دووپـات بکەیتـەوە کەوا لەبەری بکەیت، واتە ویستت لەسـەربێت وناخت توونـد بێـت و سووربیت لەسـەر لەبەرکردن ماوە ماوە لێی پاشگەز نەبیتەوە، چونکە بـەردەوام بـوون خـۆی لـەخۆیدا مایـەی خێرو سـەرفرازیو سـوود وەرگرتن و سـەرکەوتن و پاشـکەوت کردنە.

٨) پابـەندبوون بەنیشـانەکانی وەستان لەشوێنی گونجاوی خـۆی جا چ لەکاتی لەبەرکردن بێ یاخود لـەکاتی خوێندنـەوەو دووبـارە کردنەوە بـێ، چونکە نیشـانەکانی وەستان وەکو یارمەتی دەرێك وایە بۆ ئەوەی تا ئەوپەڕی بەشێوەیەکی تـەواوو رێـك و پوخـت لەبـەری بکەیت.

٩) بیرکردنـەوەو سـەرنج دان و تێ رامـان لـەوەی دەی خوێنیتـەوە شتێکی تایبـەتی گرنگە ئەمەش چ لەحاڵەتی خوێندنەوە بێ یا خود لەحاڵـەتی لەبـەرکردن بـێ یـان لەحاڵەتی گوێگرتن بێ.

١٠) پابەندبوون بەبەکارهێنانی یەك قورئان یاخود یەك شێوە چاپی قورئـان چونکە بـەکارهێنانی زۆر قورئان و گۆڕانی چاپەکان ئاڵۆزیت لادروست دەکات و دەبێتە لەمپەرێك لەرێگای لەبەرکردندا.

١١) کەمکردنەوەو لەبەین بردنی گونـاه و بوونـی (تقـوی) دەبێـتە هۆی ئەوەی کەوا خوای پەروردگار رووناکیو نوورو زانست و زانیاری خۆی پێمان ببخەشی قورئانمان پێ ببەخشـێ کـە تاکـە بەرنامـەی مرۆڤایەتیـیەو ژینـی مـرۆڤ دەگەیەنێتـە ئـەوجی بـەختیاریو شـادومانی بـەڵام ئەگـەر هـاتوو ناخمان ئەشکەوتی گوناه بوو ئەوا لەبـەرکردنمان کزئـەبێ و توانـای لەبـەرکردنمان نامێنـێ ئەمـەش روون و ئاشکراو دیارە.

١٢) لـەکۆتاییدا ئـەوە دەڵێـم کەوا پێویستە ئەو پەڕی سوپاس و ستایشی خوای پـەروردگار بکـەین، شوکرانە بێژبین، ئامانە هۆکـارێکن پیـادە کردنیـان دەبێـتە هـۆی سانابوونی کارە قـورس و گـران و سـەخت و دژوارەکـان، وەخـوای پـەروەردگاریش دفـەرمووێ ﴿...... ومـن یتـق الله یجعـل لـه مخرجا﴾.





# گەورەیی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزو تێگەیشتنی

هاوار مورتکەیی



یارانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەوەزیفەی خوێندنەوەی قورئان گەیشتبوون، بەبێ هیچ رتووش و بەهەڵەداچوونێك بەتەواوی لێی حاڵی ببوون، خوێندنەوە ئامرازێکە بۆ فێربوون و بەدەست هێنانی بروانامەی خوێندن، ئادەمیزادیش بۆ ئەوە فێر دەبێ لەدونیاو دواماهیدا سەرکەوتن بەدەست بێنێ، چونکە زانست تەنها چێژێکی بێ گیانی دوور لە مەبەست نییە هەربۆیە خودای گەورەو میهرەبان ئاشکرای کردووە کەوا زۆرترین کەس کەڵێ بترسن زاناکانن (انما یخشی الله من عباده العلماء).

یارانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خوێنەری چاك و سەرکەوتووی ئایەتە پیرۆزەکان بوون و وەزیفەکانی شارەزا ببوون.

هەروەها بنەما راست و دروستەکانی خوێندنەوەی کاریگەریان جێبەجێ دەکرد، لەوە گەیشتبوون کەوا تێگەیشتنی ئەو شتەی کە دەخوێندرێتەوە بنەمای گواستنەوەی وەرگرتنی مێشکە بۆ جێبەجێکردن، هەروەها زانیبوویان کەوا دەقی قورئان چەندین بیرۆکەی سەرەکی هەیە، خوێنەر بەر لەوەی بچێتە ناو وردەکارییەکانی وشەکانەوە تێیان بگات.

شێوازی خوێندنەوەی یاران دەکرێ بەپێی ئەو بنەمایە دابرێژێ (دەخوێنم تا فێربم)، وە فێردەبم تا تێ دەگەم، ئەو جۆرە خوێندنەوەیە یارمەتی ئادەمیزاد دەدات لەوە بگات کە دەیخوێنێتەوە، تا بتوانێ کاری پێ بکات، هەروەها یاران باش لەوە گەیشتبوون کە قورئانی پیرۆز کلیلی کارکردن و بوژانەوەیە، ئەگەر موسڵمانەکان توانیان دەست بەهۆکارەکانی بوژانەوەوە بگرن و بەچاکی مامەڵەی لەگەڵدا بکەن دەبوژێنەوە، چونکە لەهەندێك لەپیاوچاکان دەگێرنەوە دەڵێن: (ئەگەر گوێم لەبەشێکی قورئانی پیرۆز گرت و تێ نەگەیشتم، بۆ خۆم دەگریم)، چونکە خودای گەورەو میهرەبان دەفەرموێ: (وتلك الامثال نضربها للناس ومایعقلها الا العالمون).

یاران دەرکیان بەپەیوەندی نێوان زانست و عەقڵدا کردبوو. جیاکردنەوەی زاناو لێزانیش هەر بەرێگای زانست و لەبەرکردن نەبووە، بەڵکو لەرێگای تێگەیشتنی ژیان و زیندەوەرزانی بووە، کە دەبێتە هۆی ئەوەی زانیارەکە بگاتە پلەیەکی بەرز کە شایانی ئەوەیە هەڵوەستەیەکی لەلا بکرێت، ئەمەش لەتوێی قورئانی پیرۆزدا هاتووەو خودای گەورە دەفەرموێ: (افلا یتد برون القران أم علی قلوب اقفالها).

دڵی داخراو جۆرێکە لەجۆرەکانی رۆشنبیری بەشێواز کە تیایدا تیۆرلەگەڵ جێبەجێکردن لێك جیا دەبنەوە، بەلام موسڵمانە سەرەتاکان هەستیان بەپەیوەندی نێوان تیۆرو جێبەجێکردن (التنظیر



والتطبيق) كردبوو فێربوون لای ئەوان چەشنی فێربوونی ناو وەرشەیەكی كاركردنی ئێستا بوو لەگەڵ جیاوازی نێوانیان، هەروەك چۆن پزیشك و ئەندازیارو زانای كۆمپیوتەرو كارەباچی بەش بەش پیشەكەی خۆی فێردەبێ بەشێكی تیۆری پاشان جێبەجێكردن لەپاشان وانەی دووەمی دەست پێ دەكات، ئەوانیش ئەو راستیەیان بەتەواوەتی زانیبوو. هەروەها دەیانزانی كەوا مانای (فیقیە) (لێزانی) زۆر فراوانە، واتە لێزانی گەردوون و ژیان، لێزانی دەروون و لاشە، زانینی نهێنییەكانی بروسكەو هەورە تریشقەو ئاسن و سەرجەم دیاردەكانی سروشت و ژیان بەتەنیا زانستێكیان گرێ نەدابوو. بەرادەیەك یەكێك لەزاناكان دەڵێ: (لەسەر ئەو كەسەیە كە قورئان فێر دەبێ، پێویستە لێزان بێت). لەبەر ئەوە بەترسەوە قورئانیان لەبەركردو بەوردی دەیان خوێندەوە، چونكە دەیانزانی رووبەروو بوونەوەی ئەو كارە چەند گەورەیە، مرۆڤی ئەو سەردەمە زێرینە بیری دەكردەوە كە چۆن كاربكات؟... بەر لەوەی بیر لەوە بكاتەوە كە چۆن لەبەری بكات.

یەكێك لەپیاوە چاكەكانی ئەوسا وای بۆ دەچێ كەوا لەسەر موسڵمان پێویستە بەشێك لەقورئان لەبەر بكات، بۆ ئەوەی نوێژەكانی خۆی پێ بەهێز بكات، چونكە ئەوزانایە تەواو لەوە گەیشتبوو كە زیادەڕۆیی لەزانست پێویستی بەكاری زۆرتر هەیە.

یاران واتەماشای قورئانی پیرۆزیان دەكرد هەروەك سوێندی سەربازێك یا پزیشكێك بێت كە هەردەبێ بچێتە ژێریەوەو بیڵێتەوە، بەڵام بەترس و دڵەراوكێوە، چونكە تەواو لەوە حاڵی ببوون كە قورئان (پەیمانە)، پەیمانێكی بەهێزتریش ﴿واخذنا منهم میثاقاً غلیظاً﴾ ئەم زاراوەیەش (١٠) جار لەقورئاندا دووبارە بۆتەوە، كەواتە مەسەلەكە ئاسان نییە، گەوهەری مەسەلەكەش ئەوە نییە كە مرۆڤ پیتەكان بەبێ تێگەیشتن بخوێنێتەوەو لەمەزری خۆشیدا ئەوەی دانابێت كە لەسەر هەر پیتێك (١٠) خێری پێ دەگات، مەسەلەكە ترسناكترە چونكە (پەیمانێكە) لەنێوان خودای پەروەردگارو خوێنەردا، پەیمانێكی چەند لایەنانەو ئەمانەتێك كە چیا بەرزەكان نەیانتوانی هەڵی بگرن، چونكە هەڵی بگرتایە لەترسانا شەق شەق دەبوو ﴿لو انزلنا هذا القرآن علی جبل لرایته خاشعاً متصدعاً من خشیة الله﴾. لەسەر بنەمای ئەو پەیمانەی نێوان خودای باڵادەست و خوێنەر لەسەر هەموو كەسێك پێویستە كە زانستێك بزانێ خەڵكی لێ فێر بكات، ئەو كەسەی كە حیكمەتێكیش دەزانێ نابێ لەخەڵكی بشارێتەوە.

یاران تێگەیشتنێكی دیكەیان هەبوو بۆ مانای (لەبەركەرانی قورئان) كە جیاواز بوو لەتێگەیشتنی ئێستای ئێمە، بۆ نموونە (حذیفة) لەشەڕی (الیمامە)دا بەشداری كرد، هاوڕێكانی ئاگاداریان كردوە لەجەنگدا دوا نەكەوێ، بۆیە فەرمووی: (من هەڵگری قورئان نیم، ئەگەر بەر لەمن لەمەیدان دابن).

موسڵمانەكان لەو جەنگەدا (١٣) هەزار جەنگاوەر بوون، بەڵام فەرماندەی موسڵمانان (٣) هەزاری لەكەتیبەیەكی تایبەتیدا جیاكردەوەو ناوی نا (كەتیبەی خوێنەرانی قورئان) كە جەنگێكی گەورەی بەرپایان ئەنجام دا تا لەئاكامدا (٥٠٠) لەخوێنەرە هەرە شارەزاكانی قورئانی پیرۆز گیانیان لەدەست داو شەهید بوون.

دەبا خوێندنەوەی خۆمان لەگەڵ خوێندنەوەی ئەوان، پاداشت و خێرو چاكەمان لەگەڵ پاداشتی ئەوان، قورئان خوێنەكانی خۆمان لەگەڵئەوان بەراورد بكەین كە بێگومان زۆر لەیەكتری جیان و جیاوازیان زۆرە.

---

سەرچاوە: جریدة الحیاة، العدد (١٣٠٦٠) في ١٩٩٨/١٢/٦.



# ئافرەت لەنێوان ماڵ و كۆمەڵدا

نووسینی: البهی الغولی
وەرگێڕانی:
جەمال گردەسۆری

لەئاڵۆزی‌یەكانی شارستانی‌یەتی نوێدا، مەسەلەیەكی ئافرەت هاتۆتە گۆڕەوەكە لەبارەیەوە زۆر گفتوگۆو باس‌و خواس دەكرێ. هەروەها هێنان‌و بردن‌و بگرەو بەردە. هەندی لەو كەسانەی كەبەرگری لەمافی ئافرەت دەكەن هەرایەك دەنێنەوە دەربارەی ئەو ستەمەی كە لێی كراوە، تاڕادەی خنكاندن. وابیر دەكەیتەوە چەند ئوردوگایەكی بەند كردن هەیە ئافرەت بەزنجیرو پێوەندەوە بۆی دەبردرێ‌و لەوێوە ئازار دەدرێ. ئەوانەش هیچ راستیەك‌و بەڵگەیەكیان نی‌یە كەبۆی هاوار دەكەن تەنها لاسایی كردنەوەی ئەوروپایی‌یەكان نەبێ. ئێمە حەز دەكەین لەم نوسراوەماندا بەگیانێكی هۆشمەندانەی ورد بابەتەكە چارەسەر بكەین. كە دوور بێ لەدژایەتی‌و ناكۆكیەكان‌و پەیوەست بێ بەراستی‌یەكانەوە، بێ ئەوەی سەیری هیچ شتێكی تر بكرێت. كاتێ دەڵێین (هۆشمەندانەی ورد) مەبەستمان ئایینی ئیسلامی پاك‌و بێگەردە كە ئەمەش داهێنانی خوایە كەوا مرۆڤی لەگەڵدا سازاندووە. یەكەم شت كەپێویستە ئاگاداری بین - بەگیانی ئەم هۆشمەندیە.. ئەوەیە كەوا هەندێ لەبەرگری كارانی ئافرەت لای ئێمە تاڕادەیەكی زۆر رەوشتی لاسایی كردنەوە كاری تێ كردنەوە، كاری تێ كردوون بۆ هەر شتێ رۆژئاوایی بێ، بێ گومان رۆژئاوایی‌یەكانیش شتی باشیان هەیە، گومانیش لەوەدا نی‌یە كەوا شتی خراپیشیان هەیە.

جا ئەگەر لاسایی كردنەوەكە هەڵبژاردنی شتی گونجاو بوو لەچاكەكانیان ئەوا لاسایی كردنەوەیە كەئێمەش داوای دەكەین. شتی چاك ئامانجی ئیمانداڕانە، لەهەر شوێنی ببینێ ئەو لەهەموو كەس پتر مافی پێوەیەتی. بەو شێوەیەی كە لەفەرموودەی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێ) هاتووە، بەڵام ئەگەر لاسایی كردنەوە لەسەر بناغەی لەدەست دانی كەلەپوری باش‌و هەڵس‌و كەوتی چاك بێ، وەكو وا تێبگەین ئەوەی هەمانە بێ كەڵكەو هی رۆژئاوایی‌یەكانیش سوودبەخشە، ئەمە لەسێدارەدانی بنەڕەتەكانی هۆش‌و گیانی بە: لەنەتەوەیی‌و مێژوویی‌و ئاینیدا. پێویستە ئاگاداری خۆمان بین لەرۆیشتن لەسەر ئەم رێگە ترسناكەو لەسەرەخۆ بین لەهەڵبژاردنی لایەنی باشی خەڵك. پێویستە تێبینی دیاردەیەكی تر بكەین، ئەویش كێشەی ئافرەتە، كەوتۆتە نێوان دووبەرەوە، بەرەیەك ئارەزووی بەرەڵڵایی دەكات، بەرەكەی تریش ئارەزووی چەندی لەتوانابێ بۆ ئامادەكردنی هۆیەكانی پاكی‌و بەڕێزی‌و ئافرەت دەكات. بەرەی یەكەم وا سەیری بەرەكەی تر دەكات كەوا كۆمەڵەپەرستێكن بەرەنگاری پێشكەوتنی ئافرەت دەكەن. بەرەكی تر بەبانك هێشتن بۆ بەرەڵڵایی هەڵدەچێت‌و ئەوروژێت، خۆی پێ راناگیرێت ئافرەت وا ببینێ خۆی لەدەست بدات لەشەقام‌و بازاڕەكانداو ماڵی خۆی لەجێ‌و پەیامەكەی بخاتە لاوە. ئا بەم شێوەیە هەردوو بەرە دەكەونە بارێكی هێرش بردنە سەرو بەرگری كردنەوە. لەهات‌و هاواری شەڕەكەداو لەشەوە زەنگی‌دا پلەو پایەی ئافرەت لەهۆشی زۆر كەسانەوە شێوەیەكی دروستی وەرنەگرتووە. ئایا مافی ئەوەی هەیە بچێتە دەر لەماڵ؟ یان نی‌یەتی ئایا ئەو بەدی هێنراوەیە خاوەن هەل‌ومەرجی داوێن پاكی‌یە كەوای لێ بكات جێی متمانە بێت؟ یان بەجێی هێنراوێكە پەنا دەباتە بەر شەهوەت‌و بەدوای دەكەوێت



هەر کاتێ بۆی رێك بکەوێت؟ ئایا مافی کارکردنی ئازادانەی هەیە؟ کاروباری حکومی و رامیاری؟ یان نابێ ئەمانە بکات؟ بەداخەوە بانگ کەران بۆ مافی ئافرەت، لایەنی رەوشت پاکی دەخەنە پشتگوێ، ئەگەر بەرووبانا لەهەر بۆنەیەکا دەنگێ بەرز نەکرێتەوە دژی ئەو هۆیانەی کەبۆ ئافرەتی ساز دەدەن بۆ بەرەڵلایی و لەخشتەبردن، ئەم دەنگ نەکردنە پێشوازی لێ دەکرێت.. بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ- کاتی واش هەیە دەیانبینی و گوێت لێیان دەبێت دەیکەنە قیژە قیژو هەراو هۆریا هەر کاتێ زانایەکی ئایینی قسەیەك بکات دەربارەی ئەوەی خوا چی بڕیارداوە بۆ ئافرەت لەرەوشت بەرزی و پلەو پایەی بەرزدا. وەکو ئەوە وایە سنووری شەرع لای ئەوان لەئارەق و قومارکردن و لەشی رووتی مەترسی پترە لەسەر ئافرەت و کۆمەڵ. وەك ئەوەیە کۆمەڵ باری خۆی رێك و خۆش کردووە بەهۆی ئەم سنوور شکاندنانەوە لەرێ دەرچوونانەو هیچ مەترسی‌یەکی نایەتە رێ تەنها بەناوهێنانی وشەی (خوا) نەبێ. بەڵام ئەوەی کەبەهۆی هۆشی چەند کەسانێکەوە دێت گوایە نارازی بووان مەبەستیان ئەوەیە کەوا ئافرەت لەخۆیەوە بەدی هێنراوێکی شەیتانی‌یە، هەر کاتێ بۆی بکرێ بەدوای شەهوەتەوە دەکەوێت، هیچ شتێ بۆ ئەو دەست نادات تەنها بەدگومانی لێ کردنی نەبێت. ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵەیە، بەڵگەیەکیان لەسەر قسەکەیان نی‌یە. لەراستی‌دا ئەوان لەسەر ئەو باوەڕەدان هۆش و بیری ئافرەت بەشێوەیەکی باش ئامادە دەکرێت، گرنگی بەهیچ شتێ نادەن تەنها بانگ هێشتنی بەرەڵلایی نەبێت. لەگەڵ بڵاوکردنەوەی رێکاکانی سەرنج راکێشان و لەخشتەبردن. ئەگەر بێت و لێپرسراوانی ئایینەکەمان هەڵبسن بەپاککردنەوەی دەوروبەر لەفتنەو داوێن پیسی، ئەو کاتە داوێن پاکی بنەڕەتێکە لەبنەڕەتەکانی بانگ هێشتن بۆ مافەکانی ئافرەت. جا زۆر لەمەسەلەکانی ئەم کێشەیەوە بەباشترین شێوە چارەسەری دەکرێن.

**مەبەست لەداوێن پاکی دوو شتی بنەڕەتی‌یە :**

یەکەم: دوورکەوتنەوەی ئافرەت لەکۆمەڵەو کۆبوونەوەکانی پیاوان و گەران بەدوای دیتنیان، تەنها ئەو کاتە نەبێ کەزۆر پێویست بێ یان بۆ پێداویستی‌یەکی بەجێ بێت.

دووەم: گرنگی دان بەجل و بەرگی بەشێوەیەك کەتەسك و تەنك نەبێت، قورئان ماوەی خۆڕازاندنەوەی ئافرەتانی قەدەغە کردووە وەك هی سەردەمی نەزانێتی یەکەم، فەرمانی داوە هەموو لایەکی لەشی خۆیان داپۆشن. چونکە بێجگە لەهەردوو دەست و دەم و چاو ئەوی دی هەمووی عەورەتە. هەروەها پێویستە جوانیەکەی بشارێتەوە لەپیاوان و لەناو شەقامدا، تەنها مێردی و ئەوانەی خوا ماوەی پێ داون بۆیان هەیە ببینن، ملکەچی کردنمان بۆ ئەمە مایەی دوو دڵی نی‌یە، هەتا ئەوانەی گەلێ بەگەرمیەوە بەرگری لەمافی ئافرەت دەکەن ناتوانن بەڵگە بهێننەوە لەسەر داوێن پاکی بەم واتایەی کەهێنامانەوە دژی بەرەو پێشەوە چوونە، هەروەها رەوشت بەرزیش پێوەندێکی ستەمکارە بۆی کەدەبێ لێی رزگار ببێت. پێویستە بۆ ئەم سەرەتایە، سەرەتایەکی رەسەنی تر زیاد بکرێت، کەئەویش (فطرة)یە دەیهێنێتە دی و جۆری ستەمەکانیش دەیکەن بەپێویستی ماڵ و خانوو گۆڕەپانی سروشتی پەیامی ئافرەتە. لەژێر رۆشنایی ئەم دوو سەرەتایە دەتوانین بڕیاری ئایینی ئیسلام روون بکەینەوە زیاتر لەمەسەلانەی کەباسی مافی ئافرەت دەکەن.

## تێکەڵاو بوونی پیاو لەگەڵ ئافرەت:

تێکەڵاوبوونی پیاو لەگەڵ ئافرەتان، بابەتێکە بەگەرمی‌یەوە گفتوگۆی لەبارەیەوە دەکرێ، زیاتر لەپێویست لەلایەن گفتوگۆکەرانەوە گرنگی پێ دەدرێت، ئەگەر ئافرەت بەدەست هاتی بەمانا داوێن پاکیەکەی و دیاردەکان باسمان کرد.. سەرەڕای ئەمەش ئەگەر زانیمان، مانای تێکەڵاوبوون تەنها یەکتر ببینن و دوان لەگەڵ یەکتر بێ لەکاروباری پێویستەوە، ئەوا مەسەلەی تێکەڵاوبوون کۆتایی پێ هاتووە لەلاماندا.





## تێکەڵاو بوون لەماڵدا:

أ) ئافرەت ناتوانێ ماوە بدات لەماڵی مێردی کەئامادەیە گەر بەماوەی ئەو نەبێت. پێشوازی لەوو لەویش ناکات ئەگەر پێویست نەبێ، ئەویش دەبێ مێردەکەی یان پێ بزانێ وەیان ماوەی پێ دابێ.

ب) خزمی پیاوەکە یان ژنەکە نابێ زۆر سەری لێ بدەن، یان درێژە بەدانیشتنەکەیان بدەن، بەبێ پێویستی. پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ ئەمەی قەدەغە کردووە کەدەفەرمووێ:(إیاکم ودخول الرجال علی النساء، قالوا یا رسول الله افرایت الحمو؟ قال الحمو هو الموت)، یانی ئاگاداری خۆتان بن لەسەردانی پیاو بۆ لای ئافرەتان، وتیان: خزمێکی زۆر نزیکیش (هی پیاوەکە یان هی ئافرەتەکە) فەرمووی: ئەم خزمە مردنە. مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەردانی خزمی زۆر نزیك بەشێوەیەکی بەردەوام گەلێ مەترسی بەدواوە دەبێ، لەدواجار ئەمە دەبێتە سەرەنجامێکی پڕ شەرمەزاری، لەوانە نەهێشتنی پەیوەندییەکانی خزمایەتی، یان تەلاق دان، لەوانەیە ببێتە هۆی مردن و خوێن رشتن. جا ئەگەر ئەمە بۆ خزمێکی نزیکی مێردەکە بێ وەکو برای و ئامۆزای. بێ گومان هاوڕێ و کەسانی تریش دەگرێتەوە.

ج) تەنیا مانەوەی ئافرەت لەگەڵ پیاوێکی بیانی لەماڵەوە بێ یان لەهەر شوێنی تر بێ نادروستە، تەنها ئەوکاتە نەبێ مێردی یان یەکێ دەست نوێژی لێی نەشکێ لەگەڵیابێ. بیانیش ئەو کەسەیە کەمێردی نەبێ یان دەست نوێژی لێ بشکێ. دەست نوێژ لێ نەشکاندن ئەوانەن کەمارەیی لێیان نایەت، وەکو باوکی یان برای یان منداڵەکەی. ئەم ماوە پێنەدانەش بەدگومانی نییە لەڕەوشتی ئافرەت بەڵکو لەسەر ئەو بنەڕەتەیە کە لەخودی ناوەوەی مرۆڤدا هەیە -بەپیاو و ئافرەتانەوە- لەوانەیە بەسەریانا زاڵ بێت و دوای بکەون ئەگەر تەنیا مانەوەکە درێژەبکێشێ. بۆ هێنانە بەرچاوی ئەم بارە پێغەمبەر درووی خوای لەسەر بێ دەفەرموێ:﴿إیاکم والخلوة بالنساء. والذي نفسي بیده ماخلا رجل بامرأة إلا دخل الشیطان بینها﴾ رواه مسلم، واتە ئاگاداری خۆتان بن لەبە تەنیایی مانەوە لەگەڵ ئافرەتان، سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، هەر پیاوێ لەگەڵ ژنێچکا بەتەنیا بمێنێتەوە ئەوا شەیتان (ئەهریمەن) دەچێتە لایانەوە. لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:(لایخلون احدکم بامراة الا ذی محرم)رواه النسائي، کەسێکتان لەگەڵ ئافرەتان بەتەنیا مەمێننەوە تەنها ئەو کەسە نەبێ کەمارەیی لێ نایەت. لەم فەرموودانەدا ئەمە دەردەکەوێ کەوا یەکتر بینین و دوانی ئافرەت لەگەڵ پیاو یان پیاو لەگەڵ ئافرەتدا لەخۆیەوە رێی لێ نەگیراوە، بەڵکو لەبەر ئەو ئەنجامە خراپانەیە کەبەدوایەوە دێن. ئەگەر بێت و تەنیا مانەوە نەبێ، ئەگەر هەشبێ بەڵام لەگەڵ ئەوەیە کەمارەیی یان لێك نایەت ئەو کاتە چ باسێکی لەسەر نییە.

## لەماڵ هاتنەدەر:

ئێمە وتمان ماڵ شوێنی سروشتی پەیامی ئافرەتە، جا دەرچوونە دەرەوە لێی پێویستە بەگوێرەی چەند هەڵ و مەرجێك بێت بۆ ئەوەی پەیامەکە تێك نەچێت، یان لایەنێکی لاسەنگ بکرێت، هەروەها دەبێ بۆ شتی زۆر پێویست و رێك بێت بۆ ئەوەی چوونە دەرەوە کەگونجاو بێت. ئەو مافی ئەوەی هەیە سەر بدات لەدایك و باوکی و خوشك و براکانی و ئەو کەسانەی جێی بڕوان لەخزم و دەستە خوشکەکانی. هەروەها مافی دەرچوون هەیە بۆ نوێژ کردن، بەڵام لەماڵەوە بیکات باشترە. هەروەها بۆ پێویستییەکانی چارەسەری کردن و هۆڵەکانی زانست و لێ دوان، بۆ گەشەکردن و بەرزکردنەوەی رادەی رۆشنبیری و چاك کردنی باری دەروونی و تێگەیاندنی لەئایینەکەی و فێری ئەرکەکانی دەکات لەژیاندا.. بەمەرجێ ئەم هۆڵانە نەکەوێتە بەردەستی مرۆڤی بەرەڵڵاو دڵ و دەروون نەخۆش. مافی ئەوەشی هەیە بچێتە کێڵگەو بازاڕ، یان بۆ هەر شوێنێ جێی گوناهی تیا نەبێ بۆ کڕینی پێویستییەکانی ماڵ و چارەسەر کردنی بەرژەوەندییەکانی. خێزانەکانی یاوەرانی پێغەمبەر



(صلى الله عليه وسلم) لەسەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و لەدوای ئەویشەوە ئەمانەیان هەموو دەکرد چ لێ پێچانەوەشیان لەگەڵا نەدەکرا.

## شانۆو سینەماکان:

هەندێ کەس دەپرسێ دەربارەی دەرچوون بۆ هۆڵی شانۆو سینەما.. بڕیار بۆ ئەم شوێنانە لەبەر خودی خۆیان ڕێیان لێ نەگیراوە، بەڵکو لەبەرکاری ئەو کەسانەیە کەلەشەقامەکان گەورە بووینەو بێ ئەدەبی ئەوانەیە کەوا ڕەوشتی پاکیان نییە هەروەها کاتێ لەبەرنامەکانیدا چەند دیمەنێکی دژ بەداوێن پاکی پێشان دەدرێ و نابێتە ئامۆژگاری بۆ ڕەوشتی بەکەڵك.. ئەگەر شوێنێکت بینی دەزانێ چۆن هاتوچۆکەرانی هەڵدەبژێری لەدەورو پشتێکی پاك و ڕێزی پەیامەکەی دەگرێت، شتێ پێشان نادات تەنها بۆ کات بردنە سەری ئاسایی نەبێ هەروەها چەند دیمەنێکی زانستیش، چەند چیرۆکێکی بەکەڵك هۆش و بیرو ڕەوشت پەسەندی دەکەن. شتێکی تیا نییە ئەگەر بەشداری تیادا بکرێ، چونکە بیر ڕۆشن کردن کارێکی پەسند کراوە. هەروەها خۆشی وەرگرتنێکی دوور لەخراپە کەوا شەرعی پیرۆز ماوەی داوە. کاتی خۆی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی (عائشە)ی دەکرد بۆ سەیر کردنی حەبەشەکان کەیاری‌یان بەرمەکانیان دەکرد..

## سەیرانگاکان:

دەربارەی دەرچوونی ئافرەت دەپرسن بۆ سەیرانگاکانی دیمەن ڕازاوەو هەوای خۆش و.. ئێمە نازانین کەسێ هەبێ ئەمەی لێ قەدەغە کردبێ، ئێمە دەربارەی ئافرەتانی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەخوێنینەوە کەوا دەچوونە دەورووپشتی شارەوە، ئا ئەوەتا (اسماء) کچی (ابوبکر)، خێزانی (زبێر) ڕەزای خوایان لەسەربێ، دەربارەیان دەڵێ:

(من خۆراکم[1] لەسەر سەرم دادەنا لەزەویەکەی زبێرەوە کەسێ‌یەکی فەرسەخی لەمەدینە دووربوو). زانایان وتیان: ئەمە بەڵگەیەکە بۆ سەفەر کردنێکی کورتی ئافرەت بێ ئەوەی مەحرەمی لەگەڵا بێ.

لەڕۆژانی ئێستاشماندا ئافرەتی لادێ لەماڵ دەردەچن بۆ کێڵگە، لەم دەرچوونەی گوناهێ نییە، ئێمە جیاوازی ناکەین لەنێوان ئافرەتی لادێ و هی شار، تەنها ئەو کاتە نەبێ کەئافرەتی شار تووشی دەست درێژکردنی بەرەڵڵاو کات رابوێرەکان دەبێ، ئەگەر ئاوابێ ماوەی نادرێت و پێویستە لەسەر لێپرسراو ڕێیان پێ بگرێت و شار لەخراپەکانیان پاك بکاتەوە، بۆ ئەمە فەرمانی خوا هاتووە کەدەفەرموێ:

﴿لئن لم ينته المنافقون والذين في قلوبهم مرض والمرجفون في المدينة لنغرينك بهم. ثم لايجاورونك فيها إلا قليلا..﴾الاحزاب/٦٠.

## پاسە گشتی‌یەکان:

هاتوچۆکردن لەژیانی ئێستاماندا لەشارە گەورەکانماندا لەم گیروگرفتانەیە کەوا تەنگی هەڵچنیوە بەپیاوو ئافرەتان.. شتێکی تیا نییە ئەگەر سواری ئۆتۆمۆبیلی گشتی ببێت کەزۆر چڕو پڕیش بێت ئەوەش بەهۆی ناچاری و پێویستی‌یەوەیە، چونکە زۆربەی نەفەرەکان لەقەڵەباڵغی‌دا مەبەستێکی خراپیان لەگەڵ ئافرەت نابێ، هەر لەکۆنەوە زاناکان بڕیاریان بۆ داوە لەبەر پێویستی، هەروەها بێ دەنگ بوون لەو تێکەڵاو بوونەی ژن و پیاوان لەبەجێ هێنانی بەرنامەکانی حەجداو لەتوافی دەورەی کەعبە، ئەمە تێکەڵاو بوونێکە نەپیاو نەژن بەدوای مەبەستێکی پیس ناگەڕێن. لەپاشاندا دەرچوونی ئافرەت لەماڵ لەگەڵ مێردی یان مەحرەمێکی باشترە لەوەی بەتەنیا بچێتە دەرەوە، بەڵام زۆر لەمێردان هەنە دەشڵەژێن ئەگەر دەربچن لەگەڵ ژنەکانیان، لەشەقاما کەمێ لێیان دوور دەکەونەوە لەبەر ئەوەیە یەك لەوانە دەترسێ و خۆی بەشەرمەزار دەزانێ ئەگەر هاوڕێیەکی ببینێ لەو کاتەی لەگەڵیا دەڕوات. ئەمەش نیشانەی دەروون بێ هێزی‌یە، چونکە ئێمە فەرمانمان پێدراوە لەخوا بترسین نەك لەخەڵك.

---

سەرچاوە: المراة المسلمة في العصر الحديث.





# ئایا ئیسلام دژی نەتەوەیە؟!

بەدرەدین کەریم روستایی

شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئیسلام بەرنامەیەکی گشتگیری ژیانەو ڕێز لەهەموو نەتەوەیەك دەگرێت و بوونی نەتەوەکان زمانی جیاوازی ڕەنگو روخساری بەبەڵگەیەك لەبەڵگەکانی خوای گەورە داناوە هەروەك خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرمووێ: ﴿ومن اياته اختلاف السنتكم والوانكم﴾ هەروەها ئیسلام بوونی گەلان و تیرەو هۆزەکانی بەشتێکی ئاسایی و رەوا دەزانی مەبەستی لەبوونی گەلانیش دیاریکردووە ئەوەتا خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرمووێ: ﴿انا خلقناكم من ذكر وانثى وجعلناكم شعوبا

وقبائل لتعارفوا ان اكرمكم عند الله اتقاكم﴾ خوای گەورە لەو ئایەتی پیرۆزەدا پێمان ئەڵێ مەبەست لەبوونی گەل و تیرە بۆیەکتر ناسینە نەك بۆ دژایەتی کردن و خۆهەڵکێشان بەسەر یەکتر کەوا بێ دەبێ بۆ هەندێ لەو نەتەوانەی کە کوردیان لەناو دەژی و جیرانی کوردن و خاکی کوردیان داگیرکردووە بۆچی دان بەمافی نەتەوەی کورد نانێن و فەرمان ڕەواو حکومەتەکانیان ناچار ناکەن بۆ ئەوەی مافی کورد زەوت نەکەن و کورد وەك نەتەوەیەك بناسن هەروەها گلەیی خۆمان ئاراستەی هەندێ لەلایەنی گروپی ئیسلامی دەکەین کەپێیان کوفرە ئەگەر کورد باسی مافی خۆی بکات وەك نەتەوەیەك یان ئەوەتە ئەمانە لەدەقی ئایەتەکانی قورئان تێنەگەیشتون یان خۆیان لەراستی لائەدەن ، لێرەشدا باس لەهەڵوێستی مەردانەی هەندێ لایەنیش دەکەین چ لەناوەوەو چ لەدەرەوە کەبەرگری لەمافی کورد دەکەن وەك نەتەوەیەکی خاوەن هەق و مەزلوم، ئەمەو پێغەمبەری مەزنمان(صلى الله عليه وسلم) لەو نامانەی کە بۆ نەتەوەکانی غەیرە عەرەبی دەناردن بە ئاشکرا دەیفەرموو ئەگەر ئیسلام قەبول بکەن وەك بەرنامەی ژیان ئەوا بەخۆتان حوکمی خۆتان بکەن و ئەوانەی کەباش شارەزای بەرنامەی ئیسلامن دەزانن کە ئیسلام و بەرنامەی ئیسلام دژی مافی سەربەخۆیی هیچ نەتەوەیەك نیە، بەڵام هەندێ کەسی شوفێنی و رەگەزپەرست ویستویانە بەناوی ئیسلام زوڵم لە کورد بکەن بۆ مەبە ستێکی گڵاو کە ئەویش دوور خستنەوەی کوردە لەئیسلام بەڵام میللەتەکەمان سوپاس بۆ خوا چونکە وشیارو تێگەیشتوە لەگەڵ ئەو هەموو پیلان زوڵم و زۆری شۆفینیەکانی کوردیان بەسەرا دابەش کراوەو ئیسلام زیاتر سوور بووە لەسەر ئیسلامەتی خۆی بەڵگەشمان ئەو هەموو زانایانەی کوردە کە گەورەترین خزمەتی ئیسلامیان کردووەو ئەو سەرکردانەی کوردە کە شۆڕشیان بەرپا کردوە بەتایبەتی پێشەوای خۆمان (بارزانی) کە باوەڕی وابوە ئەگەر دەوڵەتی کورد دامەزرا ئەبێ شەریعەتی ئیسلام حاکم بێ و بەڵگەشمان زۆرە بۆ ئەم راستیە بۆ نموونە زانایانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام سەربەست کردوە لەپەیڕەو کردنی شەریعەتی ئیسلام و خۆشی بەسەربازی ئەو شەریعەتە داناوە هەروەها جەنابی سەرۆکمان لەدەیان موناسەبە شانازی کردووە بە ئیسلامەتی کوردو گەورەترین خزمەتی ئیسلامی کردوە.

شتێکی ئاشکرایە کە هەر میللەتێك رووی لەئیسلام کرد بێ و شەریعەتی ئیسلامی پەیڕەو کردبێ خوای گەورە سەر بەرزی کردوە لێرەدا دوو نموونە دەهێنمە میللەتی کورد کاتێ خزمەت دینی خۆی کرد بووبە بەخاوەنی گەورەترین دەوڵەت کە دەوڵەتی (ئەیوبیە) کە نەك حوکمی کوردستانی دەکرد بەڵکو حوکمی شام و میسرو عیراقی دەکردو تاکو چەند ساڵیش پێش مەلیکەکانی کورد حوکمی میسریان دەکرد کەبەکوشتنی مەلیك فاروق کۆتایی هات ئێستاش دەیان کورد لەمیسرو لوبنان دەژین بەو کەسانەش دەڵێم کەفکریان تێك چووە لەزەمانی (صلاح الدین) فەلسەفەی قەومیەت نەبووەو



بەهەموو سەد ساڵە فکرەی نەتەوەیی سەری هەڵداوەو ئەگەر بەناوی کورد دەوڵەتی دروست کردبا نەتەوەکانی تر رازی نە ئەبوون و حوکمی شام و عێراق و لوبنان و میسری پێ نەدەکرا نموونەی دووەم تورك لەو کاتەی شەریعەتی ئیسلامیان پەیڕەو کرد میللەتان غەیری تورك بەخەلیفەی ئیسلامی زانین و سەرپەرشتی گەورەترین دەوڵەتی ئیسلامیان دەکرد، بەڵام کەوازیان لەئیسلام هێناو ویستیان بەناوی قەومیەتی تورك خۆیان بەسەر نەتەوەکانی تر فەرز بکەن هیچ میللەتێکی رازی نەبوون بەم جۆرە حوکمەو تورکیا لەدەوڵەتێکی زەبەلاحەوە بوو بەتورکیایەکی بچوك کە بێجگە لەکورد هیچ میللەتیك لەژێر حوکمی تورك نەما سەیریش لەوەدابوو ئەوەی بۆ خۆیان بەحەڵاڵ دەزانی بۆ خەڵکی تریان بەحەرام دەزانی، ئێمەش وەك کورد ئەم میللەتانە بەبرای خۆمان دەزانین و بەڵام چۆن ئەوان شانازی بەنەتەوەی خۆیان دەکەن و ئامادەنین خۆیان بتوێننەوە لەناویەك دەوڵەتی ئیسلامی گەورە ئێمەش بۆ خۆمان بەرەوای دەزانین کەخاوەنی مافی خۆمان بین و هیچ دەقێکی شەرعی نیە کەئەوەی بۆ ئەوانی حەڵاڵ بکات بۆ کوردی حەرام بکات و خوای گەورەو پێغەمبەری مەزنمان رێزیان لەهەموو نەتەوەیەك ناوە بائێمەش رێزی نەتەوەی خۆمان بزانین و رێزیش لەنەتەوەکانی تر بگرین، چونکە پێغەمبەر لەفەرموودەیەکی دادەفەرمووێ: (لافرق بین عربی واعجمی الا بالتقوی) با لەخوا ترسان میزانمان بێت لەکۆتاییدا وتەیەکی خەلیفە (عومەری کوڕی خەتتاب) دەهێنمەوە کە دەفەرمووێ (نحن قوم اعزنا الله بالاسلام فمتی ابتعدنا عن الاسلام اذلنا الله) ئینجا بادوورنەکەوینەوە لەئیسلام تا خوای گەورە زەلیل و سەر شۆڕمان نەکات لەهەر دوو دونیا لەژێر هەر ناوێ بێت کورد گوتەنی با لەرقی بەراز کرداری خۆمان بەرنەدەین) چونکە ئیسلام و نەتەوە تەواوکەری یەکترن و ئیسلام بە کورد رازاوەیەو کوردیش بەئیسلام سەر بەرزە.. دەوەرن با هەردووکیان لەدەست نەدەین.

*

# قورئان و کورد و تەفسیر

ئاری عەبدولەتیف

لەژمارەی پێشووی (خۆری ئیسلام) لەکوردستان کورتە وتارێك بڵاوکرایەوە، لەژێر ئەو عینوانەی سەرەوەدا بەڵام وەك هەستم کرد وتارەکە مافی تەواوی خۆی نەپێکابوو لەبەرئەوە لەم وتارەدا زیاتر ئەو مەبەست و ئامانجە روون دەکەمەوە.

بێگومان ئیسلام وەك بزاف و جوڵانەوەیەکی بەهێز کەهەموو جەمسەرەکانی کۆمەڵی هەژان و بوومەلەرزەیەکی بەزەبری لەهەموو راوبۆچوونەکانی باوی کاتی خۆیداو گۆڕانکاریەکی بێ هاوتای لەهزرو باوەڕی خەڵکی ئەوکات و زەمنەدا دروست کردو زۆر زوو و بەلەز بڵاوبووەو هەموو گۆڕەپانەکانی داگیرکردو هەرچی زاناو دانای ئەوکاتە هەبوو هەموو ئایین پەروەرو پیاوی ئایین بوون، چونکە ئایین دەسەڵاتی بێ قەیدو شەرتی بەسەر هەمووواندا هەبوو بۆ عەرەبیش هۆکاری یەك بوون و یەك گرتن و رزگارییان بوو لەدوو بەرەکی و نەفامی و خۆکوژی (تاڵان و پەلاماری یەك دی و لەچوارچێوەی نیشتمانێکی بێ ئاور خاك و بەروبووم دەرچوون بونیادێکی بەرفراوان و بەپیت و بەرەکەت و گەلانی غەیرە عەرەب موسڵمان بوون و لەهەموو هۆزو نەتەوەیەك دەستیان دایە خزمەت



کردنی ئیسلام و تێگەیشتنی لەقورئان و کۆکردنەوەی فەرموودەو ساغ کردنەوەو راڤەکردنی و وەرگرتنی گشت فرمان و بنەماکانی شەریعەو یاساو زۆر کاریان نەبوو بەزانستی پیتوڵی و حکمەت و مەنتیقەوەو ئەگەر لەزانستی پزیشکی و ئەندازیاری شتێك هەبووایە تێکەڵاو بوو لەگەڵ ئایین لەبەرئەوە بناغەی شەرع قورئان و تەفسیرو فەرموودەو فقە بوو.

## قورئان و تەفسیر

قورئان کەهات بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشێوەی کات و زەمەنی جیاوازو لەماوەی بیست ساڵدا بەگوێرەی پێویستی و لەکاتی رووداوو هەر جارەی چەند ئایەت دەهاتە خوارەوە لەخواوەو لەرێگەی سروشت و فریشتەی سروشتی جەبرەئیل. کەپێغەمبەر وەفاتی کرد قورئان لەیەك مەصحەف کۆنەکرابووەوە بەڵکو لەچەند پەڕاوسیپارەو لای نووسەرکانی سروش و لەسنگی یارو دیاوەران دابوو لەخەلافەتی ئەبوبەکر خوای لێ رازی فرمانیدا بەکۆکردنەوەو لەلایەن زەیدی کوڕی سابت چەند مەصحەف کۆکرایەوەو لەکاتی خەلافەتی ذی النورین عثمانی کوڕی عەفان خوای لێ رازی و لەلایەن ئەنجومەنێکی راوێژکارو بەرپرس و رای گشت یارو یاوەرانی پێغەمبەرو قورئان لەبەرەکان کرایە یەك قورئان و چەند دانەی رەوانەی وڵاتان کراو هەرچی هەبوو پاش ئەوە لەناوبرا بەخواست و ئارەزووی گشت زاناو قورئان زانەکان و دەم راست و ریش سپی و راوێژکارانی عوسمان ئەوەی گومانی تێدا نییە قورئان بەشێوەی عەرەبی و رەوان ترین زاراوەی رەسەن و باوی ناو عەرەب هاتووەتە خوارەوەو هەموو تایبەتمەندی زمانی عەرەبی تێدایەو عەرەب شارەزای شێوازی زمانی خۆیەتی و هەتا ئەوان بەچاکی تێ ی نەگەن و لێی نەگەن خەڵکانی زمان نەناسی غەیرە عەرەب چۆن تێ دەگەن ﴿وما أرسلنا من رسول الا بلسان قومه ليبين لهم﴾ لەگەڵ ئەوەش خۆ هەموو قورئان لەبەردەست هەموو یاران نەبوو و ئەوە راست نییە کەهەموو عەرەبێك لەقورئان حاڵی دەبێ و تێ دەگات زۆرجار دەبێ مرۆڤ لەماناو مەبەستی زمانی خۆی ناگات چونکە تێگەیشتنی تەنها زمانی نییەو پێویستی بەپلەیەکی باشی ژیری و فام هەیە کەواتە یاران جیاوازیان بووە گەیشتن لەقورئان، جگە لەوەش لەقورئاندا ئایەتی ئاسان و رەوان هەیە کەناودەبرێ (محكمات) و ئایەت هەیە ناودەبرێ بە(متشابهات) کەزۆری پەیوەندی بەزانست و زانیاری بوونەوەرەوە هەیەو رۆژ بەرۆژو ساڵ بەساڵ (معجزە)ی قورئان دەردەکەوێ، جگە لەوەش خۆ هەموو یارانی پێغەمبەر هەمیشە لەخزمەت نەبوون هەتا بۆنەکانی هەموو قورئان بزانن چونکە رووداوی کات و کەس زیاتر مەبەستی قورئان روون دەکاتەوە، یان جیاوازی داب و نەریتی خودی عەرەب لەبارەی بت پەرستی و زیندە بەچاڵ کردن و تاڵانی ناوخۆیان لەهەموو ئەوانەش زیاتر رەوشت و بۆچوونی جولەکەو گاوەرو ئاینەکانی پێش ئیسلام شارەزابوون رۆڵی ریشەیی هەیە لەم بارەوە. ئەگەر ئەم هەموو هۆکارە بەردی بناغەی گەیشتن بێت لەقورئان بۆ عەرەب و عەرەبی پازدە سەدە لەمەوپێش کەبەعەرەبی رەوان وەك قورئان ئاخاوتنیان کردوە کەواتە بۆ کورد چەند ستەم و نارەحەتە کە لەقورئان تێ بگات بەعەرەبی کەئێستە کەس قسەی پێ ناکات و لەرێگەی فەرهەنگ و قاموسەوە مانای وشە بەوشە دەزانرێ. لەبەرئەوەیە ئەمرۆی کورد زۆرمان پێویستە بەقورئان و راڤەو تەفسیر هەیە بەتایبەتی بەزمانی کوردی یەکگرتووو ساف و بێ گرێ و سادە ئەوەك لەچوارچێوەی زاراوەی رەق و قورسدا.

## سەرچاوەی تەفسیر

سەرچاوەی تەفسیر گەلێ زۆرە یەك لەوانە تەفسیر بەگێرانەوە لەپێغەمبەرەوە کە لەفەرموودە راست و رەوانەکەی هەر شەش کتێبە راستەکەی بەجوانی باسیان کردوە کەئەوەش گومانی تێدا نییە



کەتەفسیرێکی راستە لەگەڵ ئەم جۆرە تەفسیری زۆر لەچیرۆك زان و حکایەت خوان و خاوەن داستانەکان شتی زۆریان هەڵبەستووە لەبەر ئەوە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی فەرمووی زۆربەی ئەم سێ شتە لەراستی دوورە (تەفسیر، ملاحم، مغازی) مەبەستی امام ئەوەیە ئەوەی سەنەد راستی نەبێ جێگەی باوەڕ نی‌یە لەم سێ شتە راڤەی قورئان دروست دەبێ داستانەکانی جەنگە سەرنویشت سازەکان، مەفرەزە، جەنگاوەرەکانی چەرخی پێغەمبەر دووەم اجتهادو بۆچوونی هوشیارانە کەبەمانای بیروڕای پەسەندی زانایان کەبێگومان یارانی پێغەمبەر دوو بەشن لەم بارەوە هەندێك زۆر بەترس و هێمنی ئەم کارە دەکەن و هەندێ بەبڕواو متمانەوە دەیکەن سێیەم دەنگ و باس و بۆچوونی تەورات و ئینجیل و زانای جولەکەو گاور سەرچاوەی هەندێ تەفسیری کەبەراستی جێگەی گومان و دوو دڵی‌یەو تەنها بەشوێن گەڕانی مانای سەرسوڕهێنەرو توانابڕی مرۆڤ کەباو نەبووە لەلای عەرەب زۆر لەراڤەکەرانی پێشینی ئەو بۆچونەیان تۆمار کردووەو بەنەقڵ لەتەورات و ئینجل و شەرح و حاشیەکانی و هەندێ جار لەبۆچوونە لەڕێ لادەرەکان بەدڵ سافی و دڵ پاکی لەدوو توێی تەفسیرەکان جێگەی کراوەتەوە هەتا رادەیەك گەورەیارانی پێغەمبەر عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەفەرموێ (ئەگەر ئەهلی کتاب قسەیان بۆ کردن بڕوایان پێ مەکەن و بەدرۆی مەزانن) کەچی بەپێچەوانەوە نەك هەر بڕوایان پێ نەکرد بەڵکو هەموو گواستەوە بۆ ناو تەفسیرەکان و زانای مێژووناس و کۆمەڵ ناس ابن خەلدون دەڵێ: عەرەب خاوەن کتێب و نووسین نەبوون و دوور بوون لەزانست و سروشتیان دەشتەکی و نەخوێندەوار بوون لەبەرئەوە حەزیان زۆر لەشتی شاراوەو دەگمەن و سەرەتای دروست بوونی مرۆڤ و بوونەوەر بوو لەبەرئەوە پرسیاریان زۆر دەکرد لەخاوەن کتێبەکانی پێشوو ئەوانیش زیادەڕەویان هەبوو لەگێڕانەوەو گەورەکردنی رووداوەکان وەخاوەن تەفسیرەکان لەم رووە کەمتەرخەمیان کردو کتێبەکانیان پڕ کرد.

پاش چەرخی زێڕینی پێغەمبەرو خەلیفە راشدەکان تەفسیر کەوتە دەست شوێن کەوتووان (تابعین)و ئەوانیش بەپێی توانا هەوڵی زۆر گەورەیان دا کەمانای قورئان وەك پێغەمبەر مەبەستی هەبووە لەبەر دەست موسڵمانان دانرێ و لەم بارەوە کاری زۆر گەورەو بەرێزیا نکرد هەرچەندە لێرەو لەوێ و بەحوکمی خۆشەویستی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبوتاڵب و عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب رەزای خوایان لەسەر بێ هەندێ دانانی دەست کرد هاتە ناو تەفسیرەوە بەتایبەتی بەناوی یاری پایەبەرز عبدالله کوری عەباس و حەزرەتی عەلی پاش ئەوانە کەم کەم تەفسیر نوسرایەوەو مانای وشەو رسمەکانی قورئانی پیرۆز جۆرێك دامەزراوی بەخۆیەوە بینی و هەندێ بۆچوونی حوکم و فرمانی شەرعی و بۆچوونی فقهی لەگەڵ تەفسیر باس کرا لەسەر دەستی سوفیانی کوڕی عوبەینە و وەکیلی کوڕی جەراح و عەبدولرەزاق و ابن جەریری تەبەری.

بەکورتی و کوردی تەفسیری قورئان لەهەموو کات و زەمەن و چەرخێك شان بەشانی بزووتنەوەی زانیاری و زانستی و پێشکەوتنی فام و ژیری بۆ پێشەوە هاتووەو ئاوێنەیی چەرخی پێوە دیارو ئاشکرایەو هەر زەمەنێك هەرچی باو بووە لەبۆچوون و رێبازو رێچکەی بیروڕا لەتەفسیر ئاماژەی پێ کراوەو هەمیشە لەگەڵ زانست و زانیاری رێك و تەبا بووەو هەرگیز نەبووە، راستیەکی مەعریفی لەگەڵ قورئان دژ بێت بەڵام وەك زانایان فەرموویانە (زانست بوونەوەرێکی پڕ لەئاڵوگۆڕەو ئەوی دوێنێ نەیسەلماندوە ئەمڕۆ باوەڕی پێیە لەبەر ئەوە نابێ قورئان لەگەڵ زانست هاوکێشە بکەین چونکە زۆر بۆچوونی کۆن ئەمڕۆ بەهەڵە دەرچووە یان تەفسیر بەپێی خواست و ئارەزووی رێبازی تایبەت کەئەوەش بەمانای وشە تەفسیر نی‌یە بەڵکو راوبۆچوونە گومانی نوچدانی تێدایە.



# دۆزی کورد.. لەروانگەی کۆمەڵگاو حکومەتە ئیسلامیەکاندا!!

فەقێ ئەحمەد گەناوی

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە واقیعی کۆمەڵگای ئیسلامیو بنەماو کۆڵەگەکانی کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسی ئەو وڵاتانە، هەم لەروانگەی ئایینیو شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامەوە، هەم لەروانگەی ئایدۆلۆژیای حزب و دەوڵەتە ئیسلامییەکان دۆزی کورد شی بکەینەوە، لەئاکامدا دەبینین جۆرەها روالەتی شێواز هەم لەداوودەزگاکانی راگەیاندنیان بەرۆژنامەو گۆڤارو رادیۆو تەلەفزیۆنەوە) هەم لەرووی واقیعی پراکتیکەوە جۆرە ناتەبایيو دژایەتیەك لەهەڵوێستی ئەم وڵاتە ئیسلامیانە دەبینرێت، هەڵبەت بەجیاوازی رژێمی دەسەڵاتی سیاسیو ئەو وڵاتانە بەسیستەمی ئیسلامی یان عەلمانییەوە) وێرای پەیرەوو پرۆگرامی حزب و گروپە ئۆپۆزسیۆنە ئیسلامیەکانی ئەو وڵاتانە، تەنانەت لەئاستی رای گشتی کۆمەڵانی خەڵکی موسڵمانی ئەم وڵاتە پان و بەرینەی کە ناوی نراوە وڵاتانی ئیسلامی لەوە حاڵی دەبین کە نۆچی لەمەڕ هەڵوێست و روانینی ئەو وڵاتانە بەرامبەر بەکێشەو دۆزی رەوای گەلانی چەوساوەو ندەستی موسڵمانان لەجیهاندا وەك گەلی موسڵمانی کشمیر لەهندستان، کۆسۆڤۆ لەیوگسلاڤیای جاران، چەچانستان لە کۆماری روسیای فیدرالی، بزووتنەوەی موسڵمانانی باشووری فلپین و بزووتنەوەی بەرەنگاری ئیسلامی لەفەلەستین، هەریەکە لەو حکومەت و رژێمە دەسەڵاتدارە ئیسلامیانە بەهەموو شێوەیەك تەنانەت لەئاستی نێونەتەوەییش داکۆکی لەکێشەی ئەم گەلە موسڵمانانە دەکەن و بەهاوکاری ماددیو مەعنەویو عەسکەریشەوە هاوکاریان دەکەن بەو حوکمە باوەی کە موسلمان برای یەکترن ﴿إنما المؤمنون إخوة﴾الحجرات/١٠،یانی بەوشەیە کە نێژین ﴿انصر اخاك ظالماً او مظلوماً﴾، بەلام بۆ گەلێکی چەوساوەو زۆر لێکراوی وەك گەلی کوردی دابەشکراو بەسەر چوار پارچەو بەسەر چوار رژێمی داگیرکەری کوردستان کە هەر یەکەش لەو حکومەتانە وەك شەریعەتی دەوڵەت بۆ لەنێوبردنی دۆزی رەوای کورد لەسەر ئەوە کۆکن و هەمیشە پیلانی تاواندنەوەی بۆ دەگێڕن.

ئاشکرایە هەریەکە لەم دەسەڵاتی حوکمە سیاسیانە لەدیدی ئایدۆلۆژیو بەرژەوەندی بالاو تایبەتی خۆیانەوە بۆ مەسەلەکان دەڕوانن لەلایەك زۆر بەتوندی بەرگری لەمەسەلەی موسڵمان و چەوساوە دەکەن ئەو مافە رەوایەی پێ دەبەخشن کە شایستەی قەوارەی سیاسی سەربەخۆ بن لەلایەکی دیکەش کە مەسەلەی کورد دێتە گۆڕێ وەك کەڕو لاڵ وابن وەك نەبایان دیبێو نەباران بەتوندی بەرپەرچی دۆزە رەواکەی دەدەنەوەو تەنانەت کەمترین مافی رۆشنبیری چییە کە بەزمانی کوردی خوێندن و نووسینی



بەکوفرو هەڵگەڕانەوەی دەزانن لەپەیامی پیرۆزی ئیسلامدا... بەهەچ شێوەیەك بەئاگرو ئاسن و زیندان وەڵامی خواستەکانی جەماوەری موسڵمانی کوردستان دەدەنەوە.. تا ئەو ئاستەی کە رای گشتی جەماوەری خۆشیان چەواشە کردووە بەوەی کە بزاڤی سیاسی و نیشتمانی کورد بزاڤێکی چەپ و کۆمۆنیستییەو دژ بەئیسلام و قورئانی پیرۆزە..

لێرەوە فرمێسك رشتن بۆ گەلانی موسڵمانی فەلەستین و کشمیرو کۆسۆڤۆو بۆسناو هەرزەگۆڤین و بۆ کوردیش بەتاوانی مەسەلەیەکی دروست کراو لەلایەن ئیمپریالیزمەوە هەموو هێزەکانی خۆیان بەسیج دەکەن.

ئایا گەلی کورد لەهەر کوێیەکی کوردستانی دابەشکراو و داگیرکراو بێ نەتەوەیەکی موسڵمان نیە؟ لەوەڵامدا دەبێ لەمێژووی پڕ شانازی رۆڵەیەکی بەنەمەکی موسڵمانان کە سەرکردەی سوپای ئیسلام بووە لەدژی سوپای داگیرکەری خاچ پەرستانی ئەویش سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبییە کە دوای مردنیشی چەندین نەوەی خۆی وەك والی و پاشای موسڵمانان لەوڵاتانی میسرو شام و یەمەن بەجێهێشت و گەورەترین شانازیان بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی تۆمارکرد.

ئایا چەندین زانای گەورەو داهێنەری وەکو ابن خلکان و ابن الاثیرو ابن المستوفى و ابن ادم و بیتوشی و چەندین کەڵە زاناو بلیمەتی دیکەی کورد موسڵمان نەبوون، کە زێتر لەگەلانی غەیرە عەرەب خزمەتیان بە شارستانیەت و کەلتوری ئیسلام کردووە.

کەچی مخابن رۆژێ لەرۆژان نەمان دیو نەمان بیست کە یەکێ بەهاواری کوردەوە بێ و داکۆکی لێ بکات، بەڵگەش هەر ئەوەندە نییە کە کاتی ژن و منداڵ و پیرو لاوی شاری هەڵەبجەی کیمیاباران کراو لەچەند ساتێکدا پتر لە پێنج هەزار مرۆڤی موسڵمانی کورد شەهید کران، کوا هەڵوێستی حکومەتە ئیسلامیەکان و کوا هەڵوێستی حزب و گروپە ئیسلامیەکان کە لەپێناو دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی یەکسان کەپەیرەوی شەریعەت و قورئانی پیرۆز بکەن، بۆچی بێ دەنگ بوون چەند سەرکردەو زاناو نووسەری حزبە ئیسلامیە ئۆپۆزسیۆنەکان لە ئاست کارەساتی شومی ئەنفالی (بەدناو) وەدەنگ هاتن و تاوانەکانی رژێمیان ریسوا کرد..

گازندەو گلەییەکە هەر لەحکومەت و حزبە ئیسلامیەکانی گەلانی دراوسێ و دەرەوە ناکرێت، تەنانەت بزووتنەوەو لایەنە سیاسییەکانی ئیسلامی کوردستانی عیراقیش تا ئێستا هەڵوێستێکی روون و ئاشکرایان لەمەڕ مەسەلەی کورد نیە، ئاخۆ دەکرێ بپرسین و بزانین کە ئەم لایەنە سیاسیانە لەئاست مەسەلەی کورد چی دەڵێن، ئاخۆ داوای سەربەخۆیی کوردستان دەکەن، یان قەوارەیەکی فیدرالی یان خودموختاری ، بەهەرحاڵ من پێم وایە کە ئەم برا موسڵمانانە لێرەوە بەهانای گەلی موسڵمانی ئەفغانستانەوە دەچن و داکۆکی لەبزووتنەوەی ئیسلامی لەفەلەستین و لوبنان دەکەن..

کەچی رۆژێ نەماندی تەنانەت بە بەیاننامەیەکیش ئیدانەی حکومەتی تورکیا بکەن، لەسەر سەرکوت کردنی گەلی موسڵمانی کورد لەو بەشە داگیرکراوە.

بەهەر حاڵ رەنگە خوێنەری خۆشەویستی ئەم گۆڤارە (خۆری ئیسلام) ئەم نووسینە بەتەوەرەیەکی ئازاد بزانن بۆ ئەوەی ببێتە سەکۆیەك بۆ ئاڵوگۆڕکردنی رای پێچەوانەو دژ ئەویش بەمەبەستی زێتر وتووێژکردن و حاڵی بوون لەیەکتر.

والسلام علیکم..



# یەکەم پەیوەستی ئیسلام لەگەڵ بزووتنەوەکانی جیهانیدا

## FIRST CONTACT OF ISLAM WORLD MOVEMENTS

و. لەئینگلیزیەوە: مەحمود ئیبراهیم پێماڵکی

### ئیمپراتۆریەتە هاوچەرخەکانی رۆمو فارس

واباشە ئێمە ئێستا بەکورتی بەپەیوەندی نێوان ئەو دو ئیمپرایۆیەتە گەورانەدا بچینەوەو هەروەها باسی ئەوانە بکەین کەچۆن وردە وردە هەردوکیان لەناوچوون لەئاستی هەڵاتنی خۆری ئیسلام، داستانەکە تەنها بایەخ و کاریگەری رامیاری نیە بەڵام بایەخێکی قووڵی گیانی (روحی) هەیە لەمێژووی جیهاندا، وا خاڵ بەخاڵ باسی ئەو رووداوانەتان بۆ دەکەین.

١- ئەگەر ئێمە سەیری ئیمپراتۆیەتی بێزەتنی بکەین دەبینین کەئەو ئیمپراتۆیەتە لە کۆماری رۆماوە هەڵقولاوەو یەکەم جەنگ لەساڵی ٥٣ی پێش زایینی رویدا کاتێك قونسوڵ کراسەس (Crassus) بە دەوڵەمەند بەناوبانگ بوو لەشەری پارتیەکاندا (Partthians) تێ شکا. ئەگەر ئێمە زیاتر بەرەو دواوە بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی دەوڵەتەکانی شارەکانی یۆنان (Greek Cit7 States) سەرەنج دەدەین کەرەکسیز(Xerxes) لە ٤٧٩- ٤٨٠ی پێش زایندا یۆنانی داگیرکرد، بەڵام دەوڵەتەکانی یونان لەوشکانیو دەریادا بەریەستیەکی کاریگەریان کرد. ئیمپراتۆیەتی فارسی لەو سەردەمەدا دەسەڵاتی خۆی سەپاند بوو بەسەر لا پاڵی رۆژ ئاوای ئاسایی بچوکدا، بەڵام لەبەر ئەوەی شارەکانی یۆنانیش دەسەڵاتیان لەبەشێك لەو شوێنە هەبوو هەمیشە شەڕ ئاشتی لەنێوان فارسو جیهاهێلینیدا (Heellenic Worlob) (واتە یۆنانی) روویدەدا لەبەر ئەوەی شارەکانی یونانی لەنێوان خۆیاندا دووبەرەکی تایبەتی خۆیان هەبوو، شارەکانی پاپارتەکان زۆرجار داوای یارمەتیان لەشای مەزن (شاهەنشا)ی فارس دەکرد بۆ سەرکوت کردنی دوژمنەکانیان.

بەهۆی ئاشتی ئانتالسیداس (Antalcidas) ٣٨٧ پێش زایین، ئیمپراتۆیەتی فارسی بەواقیعی بوو بەهێزی خاوەن دەسەڵات لەسەر یۆنان لەسەردەمی حوکومەتی شایەنی ئاچەمینیای فارسدا. (Archamenian)

٢- لەدواییدا مەقدۆنیا بەپێشڕەوی ئەسکەندەر لەساڵی ٣٣٠ پێش زاییندا ئیمپراتۆیەتی فارسی داگیر کردو دەسەڵاتی یۆنانی بەسەر رۆژ هەڵاتی دوورو ناوەڕاستی ئاسیادا سەپاند، لەگەڵ سوریا، فەلەستین، میسر، باکووری ئەفریقیادا، رۆماش لەرۆژهەڵاتەوە بەرفراوان بوو تاگەیشتە دەریای ئەتڵەسسیو لەو سنور فراوانکردنە یدا لەرۆژ هەڵاتەوە ئەو هەرێمانەی داگیرکرد کە لەژێر حوکمڕانی جێ نشینەکانی ئەسکەندەر.

- دابوون هەروەها بوویە خاوەن دەسەڵات بەسەر قەراغ دەریاکانی رۆژهەڵاتی.

- ناوەڕاستدا، گەلەکانی ئیمپراتۆیەتی رۆما هەموویان لەژێر ناوی رۆماو گەلی رۆمادا توانەوە.

٣- لەو کاتەیدا چەند هێزێکی خۆ وڵاتی فارسی هەبوون کەبوونی خۆیان نیشانداو خوکومەتی شاهی ارساسیدسیان یاخود ئاشکی (Ashkanian) لەبەرواری



١٠ی زایینیدا. ئەو کردەوەیە شێوەیەکی سەرەکی ناکامەکەی شۆرش بو دژی یۆنان.

وهێزی هێرشکەری لەپارتیا بوو کەارسەسیدیەکان شکۆمەندی و ڕیزی فارسیان گێڕایەوەو سنووری رۆژئاوای فارسیان دامەزراند کە لەرۆژهەلاتی دەریای ڕەشەوە دەست پێدەکا بەرەو باشوور هەتاکووری رۆژهەلاتی پالیمرا (Palmyra) ئەو شوێنە بریتیە لەقەوقاس (جگە لەلا پالەکانی دەریای ڕەش)، ئەرمینیاو لای خواری عێراق. ئەو شوێنانە سنووری رەسمی نێوان ئیمپرتۆیەتی فارسی و رۆمانی بوون تا دەرکەوتنی ئیمپراتۆریەتی ئیسلام کە ئیمپراتۆیەتی فارسی بەتەواوی و بەشێکی زۆری ئیمپراتۆیەتی بیززەنتی لەناوبردن و هەروەها میسر، فەلەستین، سوریا ووردەوردە ئاسیای بچوکیشی بەخۆوەی پەیوەست کردو لەدوایدا ئیمپراتۆیەتی بێزنتیشی بەتەواوی لەناوبرد.

٤- دیسان قۆناغێکی تر لە مێژووی فاراسیدا هاتەکایەوە، ئەویش تێشکانی ارساسیدش (Arsacids) بوو بەرانبەر هێزی ساسانیەکان و ئەو حوکومەتە بەسەرکردایەتی ئەردە شێری یەکەم بوو لەسالی ٢٢٥ی زایینیدا. ئیمپراتۆیەتی ساسانی تەواوکەری ئینمپراتۆیەتی اچە مینیا بوو (Arcgaamenian empire)و هەروەها ئەو ئیمپراتۆیەتە دژە کردارێک بوو بۆ خراپەکاری (فساد) ئایینی زەردەشتی کە ئەو ئاینە لەسەردەمی دەولەتی ارسایدسدا پەیدا بوو، چاك کردنی بارودۆخی ئایینی تەنها شتێکی کەم بوو، و پەیوەندی ئایینی لەنێوان گاوەرکان وزەردەشتیەکاندا هەبوو، بۆ نموونە سۆفی مەزن مانی (Mani) وێنەگرو پێشڕەوی ئایینی بوو کە کۆمەلی مانیکەیزم (Manichaism)ی دامەزراند، لەسەردەمی شاپوری یەکەمدا لەسالی (٢٤١-٢٧٢)ی زایینیدا جموجوڵ و پێشکەوتنێکی وەدی هێناو ئامۆژگاری خەلکی دەکرد کە بروا بەگنۆستیك (Gnostic Faith) پەیدا بکەن، بەلام فەلسەفەی ئایینی ئەسکەندەر بروا هێنان بوو بەگاوریەتی و بڕوای کۆنی فارسی بەرێگای دوولانەی چاکەو خراپە. ساسانیەکان نەیانتوانی ئایین پاك بکەنەوە تەنها ئاگری پەرستیان کرد بەئایینی خۆیان و رەفتاریان بریتی بوو لەشوێن کەوتنی خراپە، ستەمکاری، ژیانی خۆش رابواردن، هەوەسبازی، دیاری کردنی دەسەلات و جیاوازی (امتیان) بۆ چەند کەسانێکی دیاریکراو کە پێویستی ئایینی ئەو کاتە ئەوە بوو بەتوندی بەرهەلستی ئەو رەفتارانەو بەدکردارییانە بکاو ناویان بەرێ، ئەو پێویستیە لەو کاتەدا نەکرا بەلام ئیسلام ئەو ئەرکەی ئەنجامدا.

٥- وەختێك بارەگای ئیمپراتۆیەتی رۆمانی بۆقوستەنتینیە گوێزرایە وەلەبەرواری سالی ٣٣٠ی زایینیدا، شەڕو پێکدادانی نێوان رۆما و فارس زیاتر لەجاران روویدەدا، شێوە دورگەی عەرەبی (شبه الجزيره العربيه) هەرگیز نە لەلایەن رۆمەوە نە لەلایەن فارسەوە داگیر نەکرا هەر چەند دەورووبەری ئەو دورگەیە.. لەلایەن هەردوکیانەوە داگیر کرا. واچاکە سەرەنج بدرێ کە ئیمپراتۆری رۆما فیلپ (Philip) (٢٤٤-٢٤٩)ی بەرەگەزعەرەب بووو شێوازی هونەری خانووبەرەی نەبەتیەکان لەشاری پیتزاو هیجردا زانستی تێکەلی رۆما، یۆنان، میسرو عەرەبی پێوە دیار بوو.

٦- دوورگەی عەرەبی زانستی فارسی و بێزەنتی وەرگرتبوو، بەلام تەماشاکەرێك بێدەنگ بوو بۆ ئەو جەنگانەی لەنێوان ئەو دوانەدا روویدەدا تاکو دەست تێوەردانی ئیسلام لەسیاسەتی جیهانیەوە.

٧- لەسنووری یەمەن لەلای دورگەی عەرەبیەوە ئەبیسینیەکان بەئاسانی دەیانتوانی بچنە ولاتی فارسەوە لەو بەری دەریای سوورەوە، ئەو ناوچە هەمیشە مەیدانی جەنگ بوو لە نێوان ئیمپراتۆیەتی فارسی و ئیمپراتۆیەتی ئەبیسینیدا، ئەبیسیناو دورگەی عەرەبی بۆ ماوەی چەندەها سەدە پەیوەندی رۆشنبیری و سیاسیان هەبوو، زمانی ئەمهەری زمانی ئەبیسینەکان بوو کەزۆر شێوەی زمانی عەرەبی دەکردو گەلی ئەمهەری وەکو داگیرکەرێك لەدورگەی عەرەبیەوە چوونە ناو یەمەن، ماوەیەکی کەم پێش لەدایك بوونی





پێغەمبەری پیرۆز محمد (صلى الله عليه وسلم) ئەبیسینا سەر قاڵی داگیرکردنی یەمەن بووو حوکومەتی شایەتیان بۆ وێ گواستەوە، ئەبیسینیەکان بروایان بەئایینی گاوریەتی هێنا، هەر چەندە بڕوا کەشیان لەگەڵ کەنیسەی بێزەنتیدا جیاواز بوو بەلاّم سۆزێکی زۆر لە نێوان بێزەنتی و ئەبیسینیەکاندا هەبوو لەبەر هاوبەشی ئاینەکەیان، یەکێك لەجێگری شای ئەبیسینیەکان لەیەمەن کە ناوی ئەبرە هەبوو ویستی لەمە کە ماڵی خوا (کابە) بروخێنێ، بۆ ئەو مەبەستە هێرشێکی سازکرد بەکاروانێکی فیلەوە کەتووشی بەربەستیەکی سەخت بوون و ئاکامەکەی بەلەناو چوونیان تەواو بوو هەروەکو لەقورئانی پیرۆزدا لەسورەتی (الفیل) ئەو چیرۆکە روون کراوەتەوە، ئەو رووداوە لەو ساڵە دابوو کەپێغەمبەری ئیسلام لەدایك بوو. لەو رووداوەدا جەنگێکی مەزن پیشانیدەدا کە دوورگەی عەرەبی کردە خاوەن توانا و بوو بەپێشڕەوی گەلانی جیهان، ئەو ساڵە لەرێکەوتی (٥٧٠)ی زایینی دەکا. هەر چەندە ئەو بەراوردەش دەڵاو دەق نییە بەلاّم بەرواری تەواو لە ٥٦٩ تا ٥٧١ی زاینیە، ئەبیسینیەکان تێکرۆشکان و لەجێگەی ئەوان فارس لەیەمەندا جێ گیربوو وحوکمرانی یەمەنی کرد تاکو حەوتەمین ساڵی کۆچی، واتە نزیکی ٦٢٨ی زایینی و لەو بەراوردەوە یەمەن ئایینی ئیسلامی قبوڵ کرد.

٨- روو داوی گرنگ مێژووی حوکمی بێزەنتی لەسەدەی شەشەمیەوە حوکمرانی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی (٥٢٧-٥٦٥) و لەمێژووی فارسدا حوکمی ئەنۆشیروان بوو (٥٣١-٥٩٧). ئیمپرتۆریەتی رۆمانی لەگەڵ ئەوەشدا کە ژنی ئیمپراتۆر ثیودورە (Theodora) بەدناوبوو لەژیانیدا بەلاّم ئیمپراتۆر شوێنێکی شکۆداری لەمێژوی ئیمپراتوریەتی رۆمادا داگیرکرد، ئەنەوشیرەوان لەوڵاتی فارسدا بە دادگەو بەناوبانگ بووە، ئیمپرتۆرییەتی رۆمانی و فارس بۆ ماوەی ٣٤ ساڵ هاوچەرخ بوونولەسەردەمی خۆیاندا هەمیشە کاتێك ناکاتێك لەگەڵ یەکدا جەنگاون ئاشتیان کردوە، ئەنەوشیرەوان سوریای داگیرکردو شاری بایەخداری گاورەکانی ئانتی ئۆك لەساڵانی (٥٤٠-٥٤١)دا رووخاند، بەلاّم تەنها بەرگری و خۆڕاگری بیلیسەریەس (Belisarius) بوو بەهۆی ئەوەی کە ئیمپراتۆیەتی رۆما رزگاریێ لەرۆژ هەلاّتدا لەکارەساتی زیاتر، لەلایەکی تریشەوە تورکەکان تۆرانیە ئەفاریەکانیان شکاندو قوستەنتینیەیان لەلای رۆژ ئاواوە داگیرکرد، هەروەها ئیمپراتۆریەتی رۆما لەگەڵ ئەبیسینیەکاندا سوێند خواربوو چونکە ئایینی هەردووکیان گاورەتی بوو، لەدوایشدا ئەبیسینی و فارسەکان لەیەمەن لەگەڵ یەکدا بەشەڕ هاتن، بەو جۆرە بارودۆخ لەهەمولایەکی دورگەی عەرەبیدا شڵەژا. ئەوە ئیسلام بوو کەنەك تەنها دورگەی عەرەبی دەرباز بکا بەلاّم زیاد لەوەش بەرفراوان بوو وەدەورێکی گرنگی دیت لەمێژووی جیهانیدا دوای ئەوەی ئیمپراتۆیەتی فارسی و بەشێك لەئیمپراتۆیەتی بێزەنتی لەناوبرد.

٩- سەردەمی سەدەی شەشەمی گاوریەتی و نیوەی سەدەی حەوتەم لەراستیدا لەمێژووی جیهانیدا سەردەمانێکی سەیربوون چونکە رووداوو گۆڕانکاری مەزن لەجیهانی ئەو سەردەمەدا روویاندا ئێمە باسی ئەوەمان کرد کەچۆن ئیمپراتۆیەتی رۆما و فارسی دەسەلاّتی خۆیان بەسەر ئەو بەشەپێشکەوتوانەی ئەوروپا، ئەفریقیا و رۆژ ئاوای ئاسیادا سەپاند، تەنها دوو وڵاتی تر هەبوون کە گرنگیەکی تایبەتیان ببێ لەمێژووی ئەو سەردەمەدەمەدا، ئەوانیش هیندوچین بوون، لەهیندوستان سەردەمێکی دەرەوشاوەی هارشا ڤاردانا.

(Harrsha Vadhana) بوو (٦٠٦- ٦٤٧)ی زایینی کە هونەر، زانستی و ئەدبیات لەگەشەکردندابوو، هێزی سیاسی لەسەر بنچینەیەکی دروست دامەزرابوو، باوەڕی ئایینی، هیندو چینی لێك نزیك کردبوونەوە، بڕواداری بوزی بەناوبانگی گەرۆکی چینی یانگ چوانگ(Yuang chwaug) یاخود یانگ تسانگ(Yuang-Tsang) یاخود سوان تسانگ (Hsuan- Tsang) گەشتە پیرۆزەکەی خۆی بۆ هیند لەساڵی (٦٢٩-٦٤٥)دا ئەنجامدا. لەچیندا حوکومەتی شایەتی پایە بڵند تانگ



(Tang Dynasty) لەساڵی ٦١٨دا دامەزرا، هونەری چینی ئەو حوکومەتە پێشەنگی هەموو جیهان بوو، لەرووی سیاسیەوە سنووری ئاشتی جەسپابوو. چین سەفیری فارس، قوستەنتینیە، ماگاداو نیپاڵ ٦٤٣دا وەرگرتن، بەڵام ئەو هوکزز درەوشانەوەو فشەڵیا تۆوی پووچەڵی تێدابوو، فارس و بێزەنتیلەقۆناغی داهاتوو دارمان، هیندوستان دوای مردنی هارشابوو بەپادشاگەردانی، ئیمپراتۆیەت چینی نەیتوانی لەدەست بەر بەرەکان بەئازادی بمێنێتەوە، سەدی گەورە لەسەدەی سێیەمی پێش زاینی دەست بەبنیات نانی کرا، لەدەوروبەری ساڵی ٦٨٣دا خیتانیەکان، لەباکوری رۆژئاواوەو تبتیەکان لەباشوورەوە چینیان بێزارکرد ئەڵمانیەکان گۆتیەکان وڤاندەلەکان زۆر فشاریان خستە سەرئیمپراتۆیەتی رۆمانی وردە وردە چوونەناو خاکی ئەو ئیمپراتۆیەتە، لەئاسیاوە ئەڤارەکان و تورکەکان فشاریان خستەسەر رۆماو فارس و هەندێ جار ئەو دوانە نەیان لەیەکتر هاندەدان، گەلانی سادەترو دواکەوتوتر لەپیشەسازیدا بەڵام رەوشت بەرزتر سەرکەوتنیان وەدی دێنا، لەناو ئەو هەموو هەڵچوون و گەردەلوولانەدا پەیامی ئیسلام هەروەکو تەزوێکی کارەبا هاتە گۆرەپانەوە بۆ جیاکردنەوەی درۆ لەراستی؛ بەتاڵ لەسەرمەدی (ابدی)، پەك کەوتەوە گەندەل لەپڕ هێزو پاك، زەمینەی مێژوو بۆ پەیدابوونی ئاینێکی تازە ئامادەکرا.

١٠- هورموزشایەتی ئەوە نەبوو کەحوکمڕانی وڵاتی فارس بکا بەڵام دوای مردنی باوکی، ئەنەوشیرەوان لەسەر تەختی فارس دانیشت (٥٧٩-٥٩٠)، ئەگەر بەهۆی لێهاتویی وژیریی جەنەڕاڵ بەهرام نەبایە ئیمپراتۆیەتەکەی دەڕوخا چونکە لەلایەك تورك و لەلایەك رومان داگیریان دەکرد، لەئاکامدا بەهرام رووبەڕووی هورمز یاخی بوو کەلەئەنجامدا هورمزی لەسەر تەختی شاهەنشاهی دەرکردو دوایش کوشتی، کوری هورمز کەناوی خەسرەوی پەرویزی دووەم بوو پەنای بردەبەر ئیمپراتۆری بێزەنتی کەناوی مۆریس بوو (Maurice)و مۆریس خەسرەوی پەروەردە کرد بەناوی کرد لەدوایشدا بەهێزی چەکداری رۆماوە خەسرەو لەسەر تەختی ئیمپراتۆیەت دانرایەوەو لەوڵاتی فارس لەساڵێ ٥٩٠ تا ساڵی ٦٢٨ حوکمڕانی کرد. لەئاخیرو ئۆخری تەمەنی خەسرەودا پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) نامەیەکی بۆ خەسرەو نارد تیایدا داوای لێکرد کەئایینی ئیسلام قبوڵ بکا بەڵام ئەوە روون نیە کە ئایا نامەکە دراوەتە دەست خۆی یا ئەوەکەی دوای ئەو حوکمڕانی کردوە، هەروەها ئاسانیش نیە کەبەوردی بەراوردی سەردەمی گاوریەتی هاوچەرخ لەگەڵ بەرواری کۆچیدا بزانرێ.

١١- ئەرشیفەکانی عەرەبی و فارسیدا وشەی کیسرا بۆ خەسرەوی پەرویزی دووەم ئاماژە دەکاو هەندێ جاریش ئاماژە دەکا بۆ خەسرەو ئەنەوشیرەوان کەئەوناوە خەسرەوی یەکەمە بەڵام ناوی خەسرەو بەتێکڕایی ناوونیشانە بۆشاکانی فارس بەڵام دیارە کیسرا وشەیەکی عەرەبیە بۆ خەسرەو، ناوی ئەنەوشیرەوان لەزەمانی فیردەوسی بەدواوە کورت کرایەوە بۆ ناوی ئەوشیرەوان بەڵام زاراوەی پەهلەوی ئەنەوشیرەوانە، واتە گیانێکی نەمر (روح خالد).

١٢- سوپای ئیمپراتۆیەتی رۆما دژی ئیمپراتۆر مۆریس (٥٨٢-٦٠٢) راپەڕی، هەروەها دانیشتوانی پایتەخیش دژی ئیمپراتۆ راپەڕین، سوپایەکێکی بەئیمپراتۆدانا لەجێگەی مۆریس کەناوی فۆکاس (Phocas) بوو، ناوبراو رابەری (١٠٠) سەد سەرباز بوو لەسوپای رۆمادا بەگوێرەی یاسای ئەو سەردەمە، فۆکاس بۆخۆی مۆریسی کشت داگیرکەر فۆکاس لەساڵی ٦٠٢تاساڵی ٦١٠ حوکمڕانی کرد، بەڵام لەبەرئەوەی حوکمەکەی دیکتاتۆریەت بوو هەر بەزوویی دانیشتوانی ئیمپراتۆیەت بەتێکڕایی لێی بێزاربوون هێراکلیووەس (Heraclius) کە لەئەفریقیا والی بوو خەڵکی هاندا کە فۆکاس لەناوببەن، هێراکلیووەس کوڕێکی هەبوو کەهەمان ناوی خۆی هەبوو بۆ قوستەنتینیە لەساڵی ٦١٠ تا ساڵی ٦٢٤ حوکمڕانی کرد کە ناوبراو مێژووی ئیسلامدا بەهیرقەل ناسراو.



١٣- حەسرەوی پەرویز خۆی ناو دەبردەیە کوڕی ئیمپراتۆ مۆریس، لەسەردەمی پەنابردیندا بۆ قوستەنتینیە ژنێکی بێزەتنی هێنا کەناوی مریەم بوو، هەندێ لەمێژوناسەکان دەڵێن ئەو ژنە کچی ئیمپرتۆرامۆریس بووە، بەڵام گیبۆن (Gibbon) لەوەگومانداره، هەر چونێك بێ خەسرەو هەموو سەرچاوەو هێزەکانی ئیمپراتۆریەتی فارسی بەکار هێنا تاکو لەگەڵ داگیرکەر فۆکاسدا بجەنگێ و لەساڵی ٦٠٣دا ئیمپراتۆیەتی رۆمای داگیرکرد، جەنگی نێوان فارس و رۆمابوو بەجەنگێکی نەتەوەیی و دوای لابردنی فۆکاس لەساڵی ٦١٠دا هەر دەوامی کردو فارسەکان سەر کەوتنی زۆرمەزنیان وەدەست هێناو ئەلیپۆ (Aleppo)، ئانتی ئۆك (Antioch) وشارە سەرکیەکانی سوریایان گرت لەوانە دیمەشقیشی تێدابوو کەساڵی ٦١١ داگیریان کردو ئۆرشەلیمیان لەساڵی (٦١٤-٦١٥)دا داگیرکرد کە حەوت یا هەشت ساڵ دەکا پێش بەرواری کۆچی، شاری ئۆرشەلیم کە حەوت یاهەشت ساڵ دەکا پێش بەرواری کۆچی، شاری ئۆرشەلیم سووتێنراو تالان کرا، گاورەکانیان سەربڕی و کەنیسەکانیان سووتاندو گۆڕی حەزرەتی مەسیح سووکایەتی پێ کراو هەموو شتە کۆنینەکانیان بۆ ولاتی فارس برد لەوانە خاچی مەسیح کە گاورەکان باوەڕیان وابووە کە مەسیح بەو خاچە کوژراوە، ئەو خاچەشیان بۆ ولاتی فارس برد، قەشەکانی فارس کەئاینی تایبەتیان هەبوو ئاهەنگێکی گەورەیان گێڕا بەهۆی سەرکەوتن بەسەر قەشە گاورەکاندا، لەو تالان و قەسابخانەدا جولەکەکان کە بەدەسەلاتی گاورکان رازی نەبوون بەهەرەوەزی یارمەتی فارسەکانیان دەدا هەروەها بت پەرستەکانیش پێشوازی هەموو تالان و ێرانکاریەکیان کرد. دیارە ئەو کارەساتە سەرەنج راکێشەرە کەسەرکەوتنی فارسەکان بوو بەسەرۆمادا کە لەقورئانی پیرۆزدا لەسورەی روم روون کراوەتەوە، عەرەبەیت پەرستەکان پشت گیری فارسەکانیان کرلاد بۆ ئەو وێرانکاریە چونکە وایان زانی کەتێکرودەشکانی هێزی گاورەکان مانای وایە کەبەهەمان شێوە پەیامی پێغەمبەری ئیسلامیش بوو دەستی کرد بەناردن و بلاوکردنەوەی سرووشتی (الها) خوا لەساڵی ٦١٠دا لەو کاتەیدا هەموو جیهان وایان زانی کەئیمپراتۆیەتی رۆما بەدەستی فارس لەناوچوو، بەڵام بەسرووش پێغەمبەر ئاگادار کرا کەسەرکەوتنی فارس ماوەی کورت دەبێ و لە ماوەی چەند ساڵێکی داهاتووی کەمدا دووبارە رۆماسەرکەوتن بەدی دێنێ و گوررێکی کوشندە لەفارس دەدا. عەرەبەیت پەرستەکان لەوکاتەیدا لەشاری مەکە ئازاری پێغەمبەریان دەدا بەمەبەستی ئەوەی ئەو ئازاردانە بێتە هۆی ئەوەی کەپەیامی پێغەمبەری ئیسلام پوچەڵ بکاتەوە، لەراستیدا بەگژیەکدا چوونی فارس و رۆما خواستی خوا بوو کەئەو بارودۆخانەی سازاند بۆ گەشەکردنی ئیسلام و سەرکەوتنی تا وای لێ هات کۆمەڵگای ئیسلام بوو بەهێزێکی مەزنی جیهانی.

١٤- لافاوی سەرکەوتنەکانی فارس بەداگیرکردنی ئۆرشەلیم نەوەستایەوە دیسان میسریشیان داگیرکرد لەساڵی ٦١٦ داو بەئیمپراتۆریەتی فارسیانەوە لکاند، داگیرکردنی فارسەکان لەباکوری ئەفریقاوە گەیشتە تەرابلوس، لەهەمان کاتدا سوپایەکی تری فارس ئاسایی بچووکی راماڵی و گەیشتە سنووری قوستەنتینیە. نەك تەنها جوەکان وعەرەبە پەرستەکان کەلەلایەن رۆماوە ئازاردرابوون بەڵام زۆر تایەفەی (شیعە) گاوری تریش کەبەبێ ئایینی تاوانبار کرابوون ئەوانە هەموویان لەگەڵ فارسەکان کەوتن تاوای لێهات بارودۆخی هیراکلیووەس واشکست بووشایەنی ئەوە بوو بەزەیت پێدابێ، لەگەڵ ئەو هەموو نەهامەتیانەدا نەبوو هیراکلیووەس مامەڵە لەگەڵ ئەڤاریەکانیش بکا کەلایەکی تری قوستەنتینیەوە هێرشیان دەکرد ئابلۆقەیان خستبووە سەر ئەوشارە لەگەڵ ئەوەشدا دیسان گرانی و تاعوون لەو شارە داکەوتن.

١٥- لەو بارودۆخە بێ ئومێدیانەدا هیراکلیووەس بیری لەپێلانێکی زۆر باش کردەوە، لەوەتێ گەیشت کەفارسەکان لەقوڵی دەریاوە لاوازن، هێزی دەریای خۆی خستە گەڕ کە لەدواوە هێرشیان بکاتەسەر، ئەو



هێرشە لەساڵی ٦٢٢دابوو ( کەیەکەم ساڵی کۆچ کردن بوو)، سوپاکەی خۆی لەدەریای ئیجەوە گواستەوە بۆ ئەو کەنداوەی کە لەباشووری شاخەکانی ئۆرسەوەیە، لەوێ شەڕێکی حاسیمی لەگەڵ بوو کاتی خۆی ئەسکەندوری گەورە فارسەکانی تێکشاندو لەو رۆژەدا بۆ سوریاو میسر رۆیشت، لەو شەڕەشدا گە هیراکلیووەش بەرینگاریان بوو فارسەکان بەهێرشی لەناکاو شکان بەڵام تا ئەو کاتەش فارسەکان لەئاسیای بچووك هێزێکی گەورەیان هەبوو کەدژی رۆما بیخەنەگەڕ ئەگەر دووبارە هیراکلیووەس هێرشێکی تری چاوەڕوان نەکراوی لەلای باکوورەوە لەدەریاوە نەکردبایە، بەڵام بەهۆی هێرشی دووەم فارسەکان هیچیان بۆ نەکرا. هیراکلیووەس لەرێگای دەریاوە بۆ قوستەنتینییە گەڕایەوەو پەیمانێکی لەگەڵ ئەڤارەکاندا بەستو بەیارمەتی ئەوانەوە فارسەکانی خستە تەنگو چەڵەمەیەکی خراپەوە لە دەوروبەری پایتەختەوە، لەدواهیرلاکلیووەس رابەری هێرشی کرد لەساڵانی ٦٢٣،٦٢٤،٦٢٥دا بەدرێژایی باشووری دەریای رەش دیسان بەسەر فارسەکانی دادایەوەو لەقوڵی دواوەیانەوە لەناوچەیەك لەدەوروبەری (تایبیزۆند (Tiebizond)وکارس (Kars)و لەناو ئەرمینیاوە چوەناو عێراقەوە، وەبەو شێوە ئێستا کەلەباروودۆخێکدا لەناوجەرگەی ئیمپراتریەتی فارسی بدا، شەڕێکی حاسیم لەسەرشەتی دیجلە نزیك موسڵ لەمانگی کانونی یەکەمی ٦٢٧ بەرپا بوو، بەڵام پێش ئەو شەڕە هیراکلیووەس ویستی پەیمانێك لەگەڵ تورکەکان ببەستێ و بەیارمەتی ئەوان قوستەنتینیە وەربگرێتەوە لەفارسو ئەڤارەخاینەکان کەچوبوونە پاڵ فارسەکانەوە، ئەو روو داوانە لەساڵی ٦٢٦دا بەرپابوون.

١٦- هیراکلیووەس بەهۆی سەرکەوتنەوە لەمانگی مارتی ٦٢٨دا ئاهەنگێکی گێڕا، لەوکاتەوە ئاشتی لەنێوان هەردووك ئیمپراتۆدا رووی‌دا لەسەر بنچینەی بارۆدۆخی ئێستا. لەبەر ئەوەی هیراکلیووەس خۆی پابەندی بەڵێن کردبوو لەپایزدا بۆ شاری ئێمسا چوو ولەوێوە بەپێ چوە ئۆرشەلیم تاکو ئاهەنگی سەرکەوتنەکانی بکاو خاچی (صلیب) پیرۆزیبانەوە شوێنی خۆی کەئەو خاچە فارسەکان بۆ وڵاتی فارسیان بردبوو، وگێڕانەوەی ئەو خاچە بۆ ئیمپراتۆیەتی رۆما مەرجێك بوو لەمەرجەکانی بەستنی ئاشتی لەو مەویدایەدا رێگای هیراکلیووەس بەمافووری گرانبەها داپۆشرابوو هیراکلیووەس لەپێغەمبەری ئیسلامەوە نامەیەکی بۆ هات تیایدا داوای ئەوەی لێکردبوو کەئاینی ئیسلام قبوڵ بکا، ئیمپراتۆ وادەرکەوت، کەنامەی بەڕێزەوە وەرگرت بەڵام لەناوەڕۆکی ئایینی تازە شارەزانەبوو ئەو ئایینەی کەخوا نەخشەی دانابوو، رەنگە ئەو چیرۆکەی کە دەربارەی پێغەمبەری پیرۆزەوە بۆی گەڕابێتەوە کاری کرد بێنە سەر دڵو هەستی بەڵام بەرزیو شکۆداری ئیمپراتۆتەکەیو هەراڵێ گەلەکەی نەیهێشت بەراشکاوی ئەو وئایینە قبوڵ بکا، بەڵام رایسپارد کەهەر عەرەبێك بۆ ئەوڵاتە هات دەیەوێ بیبینێو دەربارەی چۆنیەتی ئەو پێغەمبەرە هەڵسو کەوتیەوە پرسیاری لێبکا، کاتێ خۆی ئەبوسوفیان بە ئیشوکاری بازرگانیەوە لەگەڵ کاروان بۆ سوریا هاتووچۆی دەکردو ناوبراو ئامۆزای پێغەمبەر بووو لەخێڵی ئەمەویەکان بوو، بەشوێن ئەبوسوفیانیاندا نارد کەبۆ ئۆرشەلیم بچێ.

١٧- کاتێك ئەبوسوفیان بۆحزووری ئیمپراتۆ بانگ کرا، ئیمپراتۆر زۆر بەوردیو دوورودرێژی چۆنیەتی ئەو پێغەمبەر تازەی پرسیار لێ کرد، ئەبوسوفیان ئەوکاتە موسوڵمان نەبووو بگرە دوژمنی پێغەمبەر بووو دژی بانگەوازی ئەو ئایینە تازەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا چی هەبوو دەربارەی پێغەمبەرو ئەو ئایینە بەراستی ئیمپراتۆی ئاگادار کرد، وتی خەڵکی هەژارو پایە نزم بڕوایان پێ هێناوە لەدەووری کۆمەڵ بوون، هەروەها جۆرێکی سەرسام هێنەر هێزی بەشەڕیو کاریگەریان گەشە دەکاو هەر لەوکاتەوە روونا کی ئەو ئایینە چوە دڵی هەر کەسێکەوە هەرگیز ئەو کەسە فریونادرێو بۆ ژیانی نەزانی ناگەڕێتەوە، وزێدە لەوەش پاکی ئەوئایینەو ئەو خەسڵەتانەی ئەبوسوفیان



گێڕایەوە کارێکی زۆری کردەسەر بیرو هۆشی ئیمپڕاتۆر.

١٨- بەڵام پەیوەندی ئیمپڕاتۆری فارسی لەگەڵ ئیسلامدا تەواوی جیاواز بوو، خەسرەوی پەرویز یاجیێ نشینەکەی نامەی پێغەمبەری وەرگرتو بەسووکایەتی دڕاندنی، کاتێك پێغەمبەر ئەوەی بیستەوە فەرمووی یاخوا وڵا تەکەی وەکو کونامەکە دادڕ دادڕبێ، ئیمپڕاتۆی فارسی فەرمانی بەوالی خۆی کرد لەیەمەن کەبچێ و ئەو پیاوە دەست گیر بکا کە خۆی ناناسێ و نامەیەو شێوازە بۆ ئەوەی ئەنەوشیرەوان دەنووسێ، کاتێك والی فارس ویستی فەرمانی ئیمپڕاتۆرەکەی جێبەجێ بکا ئاکامەکەی بەتەواوی جیاواز بوو لەوەی کەشای مەزنی شاهانی فارس چاوەڕوانی دەکرد، والی یەمەن ئایینی ئیسلامی بۆ خۆی هەڵبژاردو یەمەن لەدەست ئیمپڕاتۆی فارسی دەرچووو بووبە دەوڵەتێکی ئیسلامی خوسرەوی پەرویز لەشوباتی ساڵی ٦٢٨دامرد.

کوڕە دڵڕەق و لاسارەکەی خەسرەو پێش مردنی باوکی، باوکی لەسەر تەخت لابردو بەندی کرد، و بۆ خۆشی دوای مردنی باوکی تەنها ماوەی ساڵێك و نیوێك حوکمڕانی کردو بۆ حوکم کردنی وڵاتی فارس بۆ ماوەی چوار ساڵێ تر نۆپالیۆراو هەبون، لەدوایدا ساسانیەکان حوکمڕانی ئیمپڕاتۆیەتی فارسیان کرد تا کاتی رووخانیان بەدەستی ئیسلام لەحەنگی مەداینداساڵی ٦٣٧، ئەو ئیمپڕاتۆریەتە مەزنە شکۆدارەی فارس کە کەللەی پڕ بوو لەتەماعکاری و لووت بەرزی تووشی لەناوچوونێکی شەرمەزاری بوو و لاپەڕەیەکی تازە بۆ وڵاتی فارس کرایەوە لەژێر ئاڵای ئیسلامدا.

١٩- ئیمپڕاتۆیەتی رۆمانیش وردە وردە چوەناویەکەوە وڵاتی لەدەستدا بەڵام بەدەستی فارس نا، بەدەستی هێزی ئیسلام کەهەردووك ئیمپڕاتۆیەتە کۆنەکانی هەڵووشین، ئەو هێزە بەچالاکیەکەوە هەڵقوڵا کە بڕوایەکی تازەی پاك بەهەموو جیهان رابگەیەنێ، لەماوەی حەوت ساڵی حوکمی هیڕاکلیووەسدا (٦٣٥-٦٤٢) زۆربەی ناوچەکانی نزیك کەنداوی عەرەبی بەئمپراتۆیەتی ئیسلامیەوە بەستران، ئیمپراتۆیەتی ئیسلامی بەردەوام پەلی راهاویشت تا گەیشتە ئاسیای بچووك لەباکوورەوەو میسر لەباشوورەوە، بەشی رۆژهەڵاتی ئیمپڕاتۆیەتی رۆمی وەکو تارماییەك دیار بوو چونکە لەدەوروبەری پایتەختەکەی وڵاتێکی کەمی مابوو لەئاکامدا قوستەنتینیە لەساڵی ١٤٥٣دا بەلشکری ئیسلام دەورە درابوو.

٢٥- ئەوە ئاکامی ئیمپڕاتۆیەتی رۆما بوو، بەڵام لەو سەردەمە سەیرەدا کە پێغەمبەری پیرۆز تێیدا ژیا گۆڕانکاریەکی تریش روویدا، ئەویش ئەوە بوو کەدەسەڵاتی ئاینی رۆما لەسەردەمی گریگۆری مەزندا (٥٩٠-٦٠٤) ئاینێکی گاوریەتی تازە بنیات نرا، لەوکاتەیدا ئایینی گاوربەتی پێشووی رۆژ هەڵات وردە وردە بەرەو نەمان چو، پاتریارکی قوستەنتینیە خۆی بەمەڵبەندی ئەسقوفیەتی جیهانی دانا کە حوکمڕانی هەموو ئەسقوفیەکانی گاورەکان بکا، بەڵام وردە وردەو بەهێواشی ئەو حوکمە کەوتە ژێر دەستی پاپای رۆماکە شێوازی خواپەرستیان لەکەنیسەکان دامەزراند لەگەڵ دەزگایەکی کەنیسە بۆ کاروباری قەشەکان کەجیاواز بێ لەکەنیسەی ئۆرثودۆکسی، دەسەڵاتی گیانی (سلطة روحية) خۆیان لەوڵاتانی بەربەر، گول و ئیسپانیادا چەسپاند، چەند موڵك و خێرا تێکیان (هبە) پەیدا کرد دەسەڵاتی کاروباری دونیاییان خستە ژێر دەستی خۆیانەوە. پاپاگریگۆری مەزن ئەنگۆساکسانیە داگیرکەرەکانی بەریتانیای خستە سەر ئایینی گاورەکان و ئیتالیای لەکاول کردن و تالا ن کردن لەدەستی فەڕەنسی و لۆمبار دەکان پاراست و دەسەڵاتی ئایینی رۆمانی بەرزکردەوە کە حوکمڕانی جیهانی رۆژ ئاوا بکا.

---

سەرچاوە:

القران الكريم و ترجمة معانية وتفسيرة الى اللغة الانكليزية الطبعة السعودية.



# مۆدێرنێتەکی بێ سەروبەرانەو کۆمەڵگا ئیسلامیەکان !!



محەمەد ئارکون** ـــــ وەرگێڕانی: نەریمان تاڵب مۆریاسی

ئێستاشی لەگەڵدابێ کەلەپوورەکە لەگەڵ رەخنەو رەخنەگرتنەکانی (تازەگەرێتیدا- مۆدێرنێتە- الحداثة)دا دەستەویەخەنەبووە، لەبەر ئەم هۆیەیە ئێمە تا ئەمڕۆکەش کەلەپووری ئیسلامی هەربە پیتی گەورە دەنووسین واتە بەم شێوەیە (Tradiition islamique).[1]

هەربۆیە خۆمان لەبەردەم کەلەپورێکی پایەدار دەبینینەوە کەپەیامێکی گەردونی هەیە، نەك هەرئەوە بەڵکو خۆشمان لەبەردەم ئەو کەلەپوورە خۆماڵیانەشدا دەبینینەوە، کەلەپێش دەرکەوتنی ئیسلامەوە لەئارادابوون و تا دوورترین رادەش نەفی کراون و تەسکتر کراونەتەوەو لەو کارەشدا دووکایە رۆڵیان هەبووە یەکەمیان: کاری ئەو ئایینە سەرکەوتووە بووە کە خاوەنی ئاراستەیەکی موستەقیم بووە، دووەمیشیان: کاری تازەگەرێتیەیە بێ سەروبەرە بووە،(لێرەدا مەبەست ئەو تازەگەرێتیەیە کە توێژە سەردەستە خۆماڵیەکان بەسەر کۆمەڵگاکانی خۆیاندا سەپاندوە).

بەڵام ئەو دوو کایەیە ئێستاشی لەگەڵدا بێت لەچاوخشاندنەوە رەخنە ئامێزەکەی گەرێتی (مۆدێرنیزم) هیچ کەڵکێکیان وەرنەگرتووە، ئەو کۆمەڵە رێبازە سیۆسیۆلۆژییانەش بەسەر کۆمەڵگاکانیان و کەلەپورەکەیاندا جێبەجێ نەکراوە، کەپێشتر بەسەر هەردوو کەلەپووری یەهودی و مەسیحیدا پیادەکراون.

لەو دەمەی ئەمە دەڵێم بێگومان لەنێوان تازەگەرییە عەقڵیە رەخنە ئامێزەکە ئەو تازەگەرییە بێ سەروبەرە چڵێسەدا جیاوازی دەکەم، کەلەپاش سەربەخۆبونەوە هاتە ناو کۆمەڵگە ئیسلامیەکانەوە دیارە ئەو سیستەمە سیاسیانەی لەدوای سالآنی پەنجاکانەوە حوکمی ئەم دەوڵەتانەیان کرد ئەوان بوون ئەو تازەگەرییەیان هێنایە ناوو کۆمەڵگاکانیانەوە ـــ ئەو سیستمانەی هەرەچەندە دەستە تەکنۆکراتەکان و چینە بازرگانەکان پاڵپشتیان لێدەکردن، بەلآم نەدەستە تەکنۆکراتەکان خاوەنی پڕۆژەیەکی سیاسی بوون و، نەچینە بازرگانەکانیش لەپێناو گەشەپێدانێکی کردەنیدا هیچ پڕۆژەیەکی ئابوورییان پێ بوو، بەڵکو تەواوی ئەو دەستەو چینانە گشتی لەناو کۆمەڵگەکانیاندا ئاخنرابوون و گەمارۆدرابوون و کۆمەڵگاکانیان بۆ ددانی بێ سەروبەرییەکی مەعنەوی و هێزی رامالدەری عەولەمەیەك جێهێڵاکە لە وزەی کەسدا نەبوو رکێڤیان بکات، بەم هۆیەوە بوو پێگەی ئەو .. کەسی مرۆڤایەتی (یەیەی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)و یاساکانی فەقێکان دەست نیشانیان کردبوو بەئاستەم دەستی بەوەکرد خۆی لەقەرەی



ئەو چاوخشاندن و توێژە رەخنە ئامێزانە بدات کەئەوروپای مەسیحی لەسەرەتای سەدەی شانزەیەمەوە بەخۆیەوە دیبوو.

دیارە مەبەستمان ئەو وتوێژانەیە کەبەعەقڵی (رێنیسانس) یانەی مرۆڤانەوە تایبەتەو لەکولتووری بت پەرستانەی گریکی و رۆمانی ئاگادارەو تێیگەیشتووە.

ئەو عەقڵەی لەچاوە سەروەرێتی دۆگمارەهاکەی عەقڵی لاهوتیدا زیاتر گرنگی بەسەربەخۆیی خۆی دەدا، ئەم پێشڤەچوونە لەگەڵ هاتنە ئاراوای عەقڵی رۆشنگەری و فەلسەفەی مافەکانی مرۆڤ و دامەزراندنی دەوڵەتی حەق و یاسا و دیموکراتیەوە بەردەوام درێژەی بەخۆی دەدا، (دەوڵەتی حەق و یاسا) مەبەست لەو دەوڵەتەیە کە لەرێگەی پەیمانێکی مەنتیقیەوە بەکۆمەڵگای مەدەنییەوە پەیوەست بوو.

ئەو پەیمانەی بواری تازەکردنەوەی تیادا هەبوو، بەشێوەیەك وایلێهات، سەروەرێتی یاخود شەرعیەتە باڵاکەی دەسەلات لەگەڵەوە وەردەگیرا، واتە لەکۆمەڵگای مەدەنییەوە وەردەگیرا بەم شێوەیە بۆ یەکەمین جار (تاك- هاولاتی) لەکۆمەڵگا مۆدێرنەکەی ئەوروپاوە سەری‌هەڵدا، ئەوە (تاکێك) بوو بەو سیفەتەی زاتێکی مرۆییە، کاتێ لەگەڵ هاولاتیەکانی دیکەدا پەیوەندی دەبەست و لەوەدەمەی بۆ کەسی تایبەتی خۆی ئازادیەکی یاسای پێکدەهێنا، تاکە کەسێکی پارێزگاری لێکراو بوو.

ئەو تاکە لەهەردوو حاڵەتەکەدا تاکێکی پارێزراوبوو، بێگومان ئەو ئازادییە یاساییانەی دەوڵەتی یاسا دەستەبەری دەکات، ناتوانێت ئەو دیاردە زۆرەملێیانە لەغوبکاتەوە کە سۆسیۆلۆژیاو ئابووری و زمان بەزۆر دەیسەپێنێت و مەرجە لەسەر پێك هێنانی هەرزاتێکی مرۆڤایەتی و ئاراستەو رەوتی ژیانیشی دادەنێت.

گوتاری هاوچەرخی ئیسلامی بەشێوەیەکی رووکەشی و ئەبستراکتی- تجریدی) خۆی بە هەڵوێست و بەهاکانی مۆدێرنیزمەوە دەبەستێتەوەو بانگەشەش بۆ ئەوە دەکات کەخۆی ئەو بەهاو هەڵوێستانەی هەیە، یاخود دەڵێت ئەوانە لە بنچینەدا هی ئیسلامن و بەرلەوەی مۆدێرنیستەی ئەوروپا بیان دۆزێتەوە سەردەمانێکی زوترو زۆر پێشتر ئیسلام زانیونی و هەر لەبەهاکانی تازەگەرێتیەوە تابە دیموکراتیەت و مافەکانی مرۆڤ؛ لەمەشدا گوتاری ئیسلامی تەنیا کارێکی پایەدارکردن دەکات و هەڵەیەکی راستەقینەی مێژوویش ئەنجام دەدات.

بانگەشەکردن بۆ ئەوەی هەموو دەسکەوتە هاوچەرخەکان و پێگەی یاسایی و سیاسی و فەلسەفیانەی کەسی مرۆڤایەتی کە لەئەوروپا دەرکەوت لەکەلەپووری ئیسلامیشدا زۆر بەروون و ئاشکراوی و بەدەق باسیان لێوە کراوە ئەوەش کارێکی هەڵەیەو لەبەهاو گرنگێتی و بایەخی کەلەپوری ئیسلامیش زێدەتر ناکات، چونکە هەموو شتێك بە مێژوێتیەکەیەوە (تاریخیتیە) مەرج دارە، واتە بەو چرکەساتە مێژووییەوە مەرجدارە کەتیایدا سەری هەڵداوە، بەڵام ئەم بۆچوونانەی من چوار چێوە مەعریفیە باوەکەی کۆمەڵگا ئیسلامیەکان ناوروژێنی، چونکە ئەو گوتار بیری مێژوویی رەخنەگرانەی پێ قەبوڵ ناکرێت بەڵکو بەتەنیا ئامادەی ئەوەیە ئەو بۆچونە تایبەتانە وەرگرێت کەلە باب و ئەژدادەوە بەمیرات ماونەتەوە، بەڵام گەربمانەوێ بەحەق وئینساف بین دەبێت بڵێین بەتەنها موسڵمانەکان نین لەپێناوی پاراستنی سەلاحیاتی کەلەپورە زیندوەکەی ئاینەکەیان داو لەدژی ئەو نموونەیەی تازەگەرێتی پێشکەشی دەکات، پرۆسەی پینەکردنێکی ئایدیۆلۆژیانە ئەنجام دەدەن.



دیارە تازەگەریتی چارەنوسێکی وا بۆ کەسی مرۆڤایەتی دادەڕێژێ و پلانی ئەوەشی بۆ دادەنێت کە (کەسی مرۆڤی) بەبێ (بیروباوەڕ) بژی، لەراستی‌دا هەموو کەلەپورەکان لەنێوان خۆیاندا کێبڕکێی یەکدی دەکەن، لەسەر ئەوەی هەر یەکەیان لەویدیکەیان پێشتر دوپاتیان لەسەر ئەم بەهایانە کردۆتەوە: نموونەی ئەو بەهایانە:- ویژدانێکی ئازاد، لێوردەییەك بەبەرز بزانرێ کە بە ئازادی ئاینی و ئازادییە گشتیەکانەوە پەیوەست بێت، لەپێك هێنانی پەیوەستەگی و (کۆمەڵە) کانیش‌دا ئازادی هەبێ، هاندانی کەسی مرۆڤایەتی بۆ ئەوەی سەربەخۆی خودێتی تەواوەتی خۆی بەرپابکات و چارەنوسە رۆحیەکەی خۆی لەسەر (زەوی) بەدی بهێنێت، بەلام ئێمە دەزانین ئەم بەهایانە دەستکردی تازەگەرێتیەکەی کۆمەڵگا هاوچەرخەکەی ئەوروپایەو کۆمەڵگا پێشینەکان بەکۆمەڵگا موسڵمانەکان و مەسیحیەکانیشەوە ئەوشتانەیان نەناسیوە .

هەرسێ ئاینە ئاسمانیەکە (ئیسلام، مەسیحیەت، یەهودیەت لەلایەك و عەقڵی فەلسەفی لەشێوازە گریکەکەی لەلایەکی دیکەوە، هەر لەکۆنەوە ئەم وتوێژانەیان درێژەپێداوە، ئەو کاتەی ئیسلام ئەم جۆرە وتوێژانەی بەخۆیەوە دەبینی ئەوروپییەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا دەژیان، بەلام جیاوازی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت و بەپلەیەکی کەمتر لەگەڵ یەهودیەتدا لەمبارەیەوە لەوەدا دەردەکەوێ کەوا لەسەدەی سیانزەیەمینی زاینیەوە لەلای ئیسلام عەقڵی فەلسەفی سڕایەوە، لەکاتێکا لەئەوروپادا عەقڵی فەلسەفی زیاتر گەشەی کردو پێگەییو بەرەو پێشەوەچوو بەتایبەتی پاش ئەوەی لەگەڵ عەقڵی زانستی و عەقڵی سیاسی هاوچەرخی دەوڵەتی یاسادا بوە هاوپەیمان ئیدی لەوەوە بەدواوە زۆر بەهێز تریش بوو، لەزۆر کاتدا ئەو هاوپەیمانییە زێدەڕۆیی و توندڕۆی دەخستەوە، بەم دواییەش زانستێکی تازەپێك هات کەپێی دەگوترێت: (مێژووی رەخنەگرانەی بەراوردکاری بۆ ئایدیۆلۆژیا تازەکان)، لەسەرەتاوە ئەم زانستە سەلماندی کەوا دەربارەی کەسی مرۆڤایەتی رەوتێکی پێچەوانە روویداوە، لێردا مەبەستمان ئەوەیە بیروبۆچوونەکانی برایەتی و یەکسانی و بڵند پایەبوونی ئاکارو رۆحی مرۆڤ بەوسیفەتەی ئیرادەیەکی زیندووەو لەدیاردەکانی پشتی سنورو رەگەزو وەلاتانە ناشەرعیەکانیش بەرپرسیارە دەشێت ئەم بیروبۆچونانە لەسەرەتاوە وەکو تۆوێکی بنچینەیی وابووە کەبۆ ئەوە روێندراوە تالەلای ئیماندار هەستێکی وا دروست بکات بتوانێ بەهۆیەوە ئاگایی خۆی بۆ (جیاوازی کردن تەمەیز)ی شتەکان گەشەپێبدات، لەوەشدا دەستەواژەی (گوتار -خطاب) بەکارهاتووە ناتەواوی کەلەپورە جولەکەیی و مەسیحی و ئیسلامیەکانیش بگرێتەوە.

لەچاوو کەلەپووری ئیسلامی‌دا، کەلەپوری جولەکەیی- مەسیحی لەم بوارانەی (مێژوی کەس)ی‌دا لێکۆڵینەوەی زیاتری لەسەرکراوە، هۆکاری ئەوەش ئەوەیە (رێبازە منهاج)ە تازەکان لەهەموو سات و لەهەموو جارێکدا بەشێوەیەکی درەنگ نەبێ بەسەر کەلەپووری ئیسلامی‌دا پیادەنەکراون.

ئەو پرسیارە تازانەی زانستە کۆمەلایەتیەکان دایانهێنا یەکەمین جار لەخۆرئاواوە سەریان هەڵدا، لەبەر ئەوە کارێکی سروشتی‌یە لەپێشدا بەسەرکەلەپوری خۆرئاوادا جێبەجێ بکرێت بەرلەوەی لەسەر کەلەپورێکی دیکەو ئەوەی ئێمەدا پیادەبکرێت، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە ئەم درزە پڕبکەینەوەودووری جیاوازی مێژوویانەی نێوانمان تەسکتر بکەینەوەو خراپ تێگەیشتنی





نێوان جیهانی ئیسلامی و خۆرئاوا لەناوببەین.

ئەوەی مەسەلەکەی ئالۆزکردوە، دوو کەلتوری بەئایدۆلۆژی کراوی دژبەیەك هەنە کەهەریەکەیان لەسەر یەکدی (ئەحکامی) نێگەتیڤانەی پێش وەختیان هەیەو بەردەوامیش خۆراك بۆ ئەم خراپ تێگەیشتنە دابین دەکەن (تەغزییەی دەدەن)، نەك هەر ئەوە بەڵکو چەمکی (ئیسلام) (خۆرئاوا)شیان بۆ دووکیانی زەبەلاحی خەیاڵی و ڕێنەکار گۆڕیوە[٢].

لێرەوە هەوڵ دەدەین ئەو ڕەوتە ڕەخنەگرییە روون بکەینەوە کەدەبێتە هۆی ئەوەی مەسەلەی (کەسی مرۆڤایەتی) چاوگێڕانەوەیەکی سەرتاپاگیریانەی بۆ بکرێت، چاو گێڕانەوە یەك لەچوارچێوەی روانگەیەکی مرۆ دۆستانەی فراوان وادابێت (تەجاوزی) پێش خۆی بکات، ئەمە مانای وانییە، لەپێناوی ئەم پرۆژە مەعریفیە تازەیەدا کەلەپووری هەموو (بیرە- فیکرە)کانی پێشووتر رەتبکەینەوەو لەدژیان بچینە سەنگەرەوە، کەدەڵێم پرۆژە مەبەستم ئەو پرۆژەیەیە کەحاڵی حازر لەگەڵ دیاردەکانی (عەولەمە- بەجیهانی کردنی)ەکەی ئێستادا ڕێ دەکات.

بێگومان ناچارین گوزارشت لەهەموو سیاقە هاوچەرخەکانی ئیسلام (یاخود هەموو کۆمەڵگەکانی) بکەین تابتوانین دەستنیشانی ئەوەبکەین ئاخۆ تا چ رادەیەك دەرکەوتن و سەرهەڵدانی (کەسی مرۆڤایەتی تیایاندا دوادەکەوێت، یاخود بزانین ئاخۆ تا چ رادەیەك تیایاندا ئارەزوویەك بۆ سەرهەڵدانی (کەسێکی بەشەری) واهەیە کەسەربەخۆیی خۆی بێت و بەمەبەستی سەرکردایەتی کردنی کیانە تایبەتەکەی خۆی و بە هاوکاری لەگەڵ کۆمەڵگاکەیی و پێشکەوتنەکانی جیهانە هاوچەرخەکە، ئازادانە ئیلتیزامات و ڕێگا چارەکانی خۆی هەڵبژێرێت).

ئەمەش مانای وایە، میکانیزمەکانی پێکەوە ژیانی تاك لەگەڵ کۆمەڵگاداو لەگەڵ ئەو سیاقە) کۆمەڵایەتیانەی ئەو پێکەوە ژیانەی تیادا رودەدات و، دواتر پەیوەندییە تەفاعولاتیەکانی کار لەیەك کردوەکانی) نێوان تاکە کەس و جەماعەو، ئەو پێگەو شوێنەی کەلەپووری ئیسلامی بۆ تاکەکەسی دیاری کردوە، هەموو ئەمانە لەجەنگی دووەمی جیهانییەوەو لەو کاتەوەی لەپێناوی رزگاری نیشتمانیدا لەدژی کۆلۆنیالیزم تێکۆشان دەستی پێکرد لەو کاتەوە هەموو

ئەمانە ژمارەیەك کودەتای وایان بەسەرداکراوە کەبەهیچ جۆرێك گێڕانەوەو لابردنیان بۆ نییە[٣].

کەواتە لە (سیاقی) ئیسلامیدا مێژووی کەس و شوێنگەکەشی (لەپێش- قبل)و (لەدوایی- بعد)یشی هەیەو، لەپێش و لەدواییەکی دەزگایانەو (مۆسساتی)، مەعنەوی و، سۆسیۆلۆژی (کۆمەڵناسیانە)و ئەنترۆپۆلۆژیانەی هەیە.

لێکۆڵینەوە لەچەمکی (لەپێش- قبل) دەمانخاتەناو روانگەی مێژوییەکی دوورودرێژەوە، ئەم ماوە دوورودرێژەش لەو رۆژەوە دەست پێدەکات کەبۆ یەکەمین جار لەمێژودا دەرکەوتنی قورئان وەکو روداوێك هاتە ئاراوە، ئەم ماوەیە (لەگەڵ هەندێك گۆڕانکاری تێبینی کراودا) هەتا ساڵی ١٩٤٠ درێژەی هەبووەو بەردەوامێتیەکی بونیاد گەرییانەی ئەبستمۆلۆجیانەی قوڵیشی لەگەڵدا بووە[٤].

هەرچی دەربارەی چەمکی (لەدواش- البعد)ە تەنیا یەك چوار چێوەی هەیە بۆ ئەوەی تیایدا لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەین، ئەو چوار چێوەیەش بریتی یە لەو ماوەیەی لەساڵی ١٩٤٠ەوە تائەمڕۆ درێژەی هەیە.

لەم ماوەیەشدا زۆر شۆڕشی توندو تیژو دابرانی توند رویانداوە، بەجۆرێك هەموو (جفرە



عورفـی-یـەکانو الشـفرات الاعرافية) جفرەکانی یاسادانانو مەعنەویو دەلالیو ئەنترۆپۆلۆژیو زانستە مرۆییە کلاسیکیەکەکان، ئەمانە زۆر بەخێرایی لەبەریەك هەڵوەشان، مەبەست لە جفرە (کۆد)ە -Code- یاخود ئەو یاسا سیمبۆلییە گشتیانەیە کە لەکۆمەڵگەدا باوە.

بەدرێژایی ساڵانی رابردوو کۆمەڵگا ئیسلامیەکان ئەم شۆڕشو دابڕانو لەبەر یەك هەڵوەشاندنانەیان بەخۆیانەوە دیوەو بەسەریاندا هاتووە، بەڵام بەبێ ئەوەی ئەم کۆمەڵگانە خۆیان بۆ ئامادەکردبێتو بەبێ ئەوەی لەرێگەی دەروازەو دەسپێکەوە پێشوازیان لەو شۆڕشو دابڕانە.. کردبێ.

ئەم شۆڕشو دابڕانو لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوانە رویانداوە بەبێ ئەوەی کۆمەڵگا بواری بۆ رەخسابێت وەکو پێویست هەرسی کردبن، بەڵکو ئەو پرۆسەیە لەماوەیەکی کورتدا رویداوە کەتیایدا چەند زەمەنێکی لەتو پەتو گۆڕاو، بەیەکیاندا داداوە، بەم هۆیەوە من دەسبەجێ واز لەو دیمەنە باوەی ئیسلام هەڵدەگرم، چ ئەو دیمەنەی لای خۆرهەلاتناسەکان هەیەو چ ئەوەی لەلای (موتەعەسیبەکان)یش هەیە، ئەم دوو لایەنە ئیسلام لەدیمەنێکی وادانیشان دەدەن کە لە (مێژوێتی-التاريخيية) خۆی یاخی دەکەن یان یاخی دەکرێت) ئەو دیمەنە نامێژوییەش - اللاتاريخيية)ش هەمان ئەو دیمەنەیە (کەبەبیانوی لەبەرچاوگرتنی بیروباوەڕی موسڵمانەکانەوە)، خۆرهەلاتناسەکان بۆ زمانە ئەوروپیەکانی دەگوازنەوە، زۆرجاریش کاتێ باسی لێوە دەکەن، لافی ئەوە لێدەدەن خۆیان بە (زنستێتی)یەوە یان (بابەتێتیە)وە، پێ بەندکردووە(٥).

بەلام ئێمە رێگایەکی دیکە دەگرینەبەرو، قورئانی پیرۆز دەکەینە خاڵی دەست پێکردنمان ئەم کارەشمان بۆ ئەوەنییە وەکو (تەبجیل کاران) هەوڵی ئەوە بدەین سەبارەت بە کەسی مرۆڤایەتی بیرو بۆچوونی تازە بدۆزینەوە، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە لەنێوان شوێنگەی مەعریفیانەی (گوتار)و ئەو پیودانگانەی دواتر بیروباوەڕە (تەشریعیەکان -یاسادانەرەکان) دایانهێناوەو لەنێوان ئەو پێشڤەچونە فیکریو کولتورییانەی لەناوەندە مەدەنیەکاندا دەرکەوتن بەراوردێك بکەین (مەبەست لەناوەندە مەدەنیەکان ژینگەی شارەکانە)(٦).

سەر هەڵدانو دواتر فراوانبونە خێراکەی دەوڵەت کە پێی دەگوترێت دەوڵەتی ئیسلامی (واتە خەلافەتی ئەمەوییو دواتر عەباسی) رۆڵێکی هاندەرانەیان هەبوو لەدروست بوونی ئەو حاڵەتەی من ناوی دەنێم (دیاردەی ئیسلامی) بۆیە وا ناوم برد تا لە دیاردەی قورئانی (الظاهرة القرانية) جیای بکەمەوە، چونکە مۆرکی جیاوازبوونو ناکۆکی دیاریکراو لەنێوان ئەو دوو دیاردەیەدا هەیەو چون یەکیش نیین وەکو ئێمە پێمان وابوو، ئامانجم لەداهێنانی ئەم دەستەواژە تازەیانە لەشێوە گرتنی (اشكلة) هەموو ئەو چەمكو دیدوبۆچونانەیە کە لە قۆناغەکانی کلاسیکیو (سکولاستیکی)(٧) فکری ئیسلامیەوە بەمیرات ماوەتەوە هەر ئەم چەمكو دیدوبۆچونانەشە خۆرهەلاتناسەکان گواستویانەتەوەو، لەهەمان کاتدا هەر ئەوانەشە بەزمانە ئەوروپیەکان گەیشتوون، لێرەدا مەبەستم ئەوەیە لەکاتی گواستنەوەیاندا بەهیچ جۆرێك شیتەڵکارییەکی رەخنەگرانەیان بۆ نەکردوە مەبەستم لە (اشكلة) لەشێوەدان (یان) لەشێوەگرتنیشتەکانە، بەلام سەبارەت بەچۆنێتی چارەسەرکردنی ئەو مەسەلە ناوەندییەی لێرەدا بەلامانەوە گرنگە (مەبەست مەسەلەی شوێنو پێگەی کەسی مرۆڤایەتی لەسیاقی ئیسلامیدا) دەبێت یەکەمین ئەرکی سەرشانمان



لەوەدابێت کە سەر لەنوێ بیرکردنەوەی خۆمان دوبارە بکەینەوەو بۆ یەکەمین جار لەهەموو ئەو مەسەلانە بکەینەوە کەبە(کەسی بەشەر)ی یەوە پەیوەستن چونکە لەو کەل و پووورەدا (کەسی بەشەر)ی توڕدراوەتە گۆڕەپانێکەوە تیایدا بیرکردنەوە لێی کارێکی موستەحیلەو لەخولگەیەکیشدا جێگیر کراوە کو حولگەی (نابیرکەرەوەیە- اللامفکرفیە)لێرەدا ئەوەی جێی سەرسوڕمان و ناچۆنیەکیەکی سەیرو سەمەرەیە ئەوەیە کەلەماوەی ( لەپاشی- واتە مابعد)(٨)ەوە گۆڕەپانی موستەحیل بونی بیر کردنەوە (مۆدێرنیزم)و (عەولەمە) هاتونەتە ناو کۆمەڵگا ئیسلامیەکانەوە چاوەنوەنواڕدەکرا لەم ماوەیەدا قۆناغی(لەپاشی- مابعد) تەسکتربێتەوە، مەبەست ئەم قۆناغەی ئێستایە کە هەڕەشەکانی مۆدێرنێتەو (عەولەمە- بەجیهانی کردن) زۆر توندو تیژو بەهێز تربوون، هۆکاری ئەمەش بۆ بڵاوبوونەوەی تیۆری فیکری دەگەڕێتەوە، ئەو رەوتەی خۆی کردۆتە تاکە رێباز بۆ بەرهەم هێنانی (یاخود دروست کردنی مێژوو (تەولید) کردنی.

* ئەم وتارە لەژمارە (٧٢١٣)ە ١٩٩٨/٨/٢٨دا بڵاوکراوەتەوە.

** مەحەمەد ئارکون، لەزانکۆی سۆربۆن فەرەنسادا ئوستادە.

## پەراوێزەکان

١) لێکۆڵینەوەیەکی پراکتیکییە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی سیمایەکی مێژوویی بۆ کەلەپورە ئیسلامیەکان، پاش ئەوەی تەواوی تەموومژاوییەکانی لێدەکرێتەوە، هەروەکو چۆن لەئەورووپادا لەدوای دەرکەوتن و سەرکەوتنی مۆدێرنیزمەوە، کەلەپووری مەسیحی لەو تەمومژیە پاك کرایەوە.

٢) وادەردەکەوێ پرۆژەکەی ئارکون زۆر فراوانە، چونکە ئامانجەکەی هەر ئەوەنییە رەخنە ئاراستەی ئەزمونە مێژوییەکەی کەلەپوور بگرێ بەڵکو ئامانجی رەخنەگرتنیشە لەئەزموونی مێژووی تازەگەرێتی خۆر ئاواش، ئەو ئەزموونەی چواردە ساڵە درێژەی هەیە.

٣) محەمەد ئارکون ساڵی ١٩٤٥ی کردۆتە خاکێکی دیار بۆ جیاکردنەوەی ئەوەی هەبوەو ئەوەی لەدوای ئەو ساڵەوە دروست بووە، چونکە لەدوای ١٩٤٥ەوە کۆمەڵگا ئیسلامیەکان خۆیان لەناو ئەزمونی تازەگەرێتیدا بینیەوە لەیەك کاتدا گۆڕانکاری پۆزەتیڤ و نێگەتیڤیانە یان بەسەرداهات.

٤) بەو پێیە قۆناغی (القبل- لەپێشی) نزیکەی چواردە سەدە دەگرێتەوە واتە لەوکاتەوەی ئیسلام دەرکەوت هەتا ساڵی ١٩٤٥، هەرچی قۆناغی (لەدوای- البعد)ە، لەنیو سەدەش کەمترە، مەبەست ئەم سەردەمەی ئێستایە کەتیایدا دەژین، وەکو لێرەدا دیارە ئارکون بڕوای وایە لەدەرکەوتنی ئیسلامەوەتا ١٩٤٥و بەدیار کەوتنی تازەگەرێتی، کەسێتی ئیسلامی بەگۆڕانێکی بنچینەی بەسەردانەهاتووە.

٥) ئەمە خاڵێکی سەرەکی مەنهەجی (رێبازی) بیری (محەمەد ئارکون)ە چونکە ئەو لەیەك کاتدا هەڵوەشانەوەی ئەو دیمەنە ئایدیالیستی و ئەبستراکتیە (تجریدی)یانەی دەوێت کە ژینگەی ئیسلامی و ژینگەی خۆرهەڵاتیەکانی لێ پێك هاتووە، ئارکون رێبازە وەسف کارییە بێ لایەنیە ساردوسڕەکەی خۆرهەڵاتناسە کلاسیکیەکان بەعەیبە دەزانێ لەو کاتانەیاندا کە لەئیسلام دەدوێت.

٦) دیسان لێرەشدا خاڵێکی بنچینەیی دیکەی بیری محەمەد ئارکون هەیە، کاتێك لەناو خۆری ئیسلامدا دوو قۆناغ جیادەکاتەوە، یەکەمیان قۆناغی (نبوة) پێغەمبەرایەتیەو دووەمیشیان قۆناغی دانانی ئەو یاسایانەیە کەدەوڵەتەکەی دیمەشق و دواتر دەوڵەتەکەی بەغا پێویستیان پێی هەبوو.

٧) بەگوێرەی ئەم قۆناغنەبەندییەی ئارکون داینـاوە، قۆناغی کلاسیکی شەش سەد ساڵی هەوەڵی تەمەنی شارستانی عەرەبی ئیسلامی دەگرێتەوە هەرچی قۆناغی سکولاستیکی (واتە سەرهەڵدانی قوتابخانەو کاوێژکردنەکانم کردنەکانم(تەواوی سەردەمی تێکچوون و پشێوی- انحطاط دەگرێتەوە کە لەسەدەی سیانزەمینەوە تاسەدەی نۆزدەیەمینی خایاند.

٨) ماوەی (پاشی- لەدوای- المابعد) ماوەی دوای جەنگی دووەمی جیهانی و سەربەخۆیی وەرگرتنە ، کەتیایدا چاوەنواڕدەکرا لەو ماوەیەدا هەموو دۆسییە داخراوەکان ئاوەڵابکرێنەوە، بەڵام بەداخەوە ئەو کارە ڕووی نەدا.

محەمەد عەلی کلای

# پاڵەوانێکی موسڵمانی سەدەی بیستەم

ئا: دەرباز حاجی حەمەد

مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی موسڵمانەو بە موسڵمان دەناسرێ، لەهەندێ لەوڵاتانی کیشوەرەکانی ئەمریکاو ئەورووپاو ئوستترالیا موسڵمانی تێدایەو روو لەزیادبوونیشە، تەنانەت هەندێ لەبنەڕەتدا موسڵمانن وەك و بۆسنە ئەمەش توانیویەتی کاریگەریەکی ئیجابی بکات لەسەر رەوتی ئەمرۆی ژیان لە تەواوی پارچەکانی جیهاندا، بەگشتی بوون بەموسڵمان لەم ساڵانەی دواییدا لەویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بەشێوەیەکی بەربڵاو پەرەی سەندوو هەموو جۆرە چین و توێژێکی گرتەوە.

رۆژنامەی نیویورك تایمز لەرۆژی ١٩٦٢/٥/١٠ لەیەکەم لاپەڕەیدا بەمانشێتی گەورە لەسەرەوە نووسیبووی کەنزیکەی ٢٠ ملیۆن زنجی بوون بەموسڵمان و رەش پێستەکان زوو هەڵدەخەڵەتێن بەرووی ئایینی ئیسلامەوە، لەمانەشدا بەموسڵمان بوونی ئەستێرەی بۆکسێنی جیهانی (محمد علي كلاي) بوو.. کلای هەر چەندە ئەمریکی بوو بەڵام موسڵمان بوو وەرزشوانێکی ناسراوو ناز ناوی چاکترین و باشترین و ئازاترین بۆکس وەشێنی بەرکەوت و لەساڵانی هەشتاکاندا لەم رووەوە درێغی نەکردوەو چەندین ناز ناوی لەسەر ئاستی جیهانی و ئەمریکی و ناوەخۆی تۆمار کرد لەکێشی هەرە قورسدا. تەنانەت تاکە پاڵەوانی بۆکسێنە کە موسڵمان بێ و لەسەر ئاستی جیهانی نەبەزێ و تا کۆتایی ژیانی وەرزشی میدالیای وەفاداری بۆ پیشەکەی و ئازادی ئیسلام و رەوتی سەربەستی و نەبوونی کۆیلایەتی بەدەست بێنێ و بەبەرۆکی موسڵمانی وەرزش بکات...

(محمد علي كلاي) موسڵمان و وەرزشوانی بەتوانا بەپاڵەوانی ئەم سەدەیە دەژمێردێت بوونیشی وەك و موسڵمانێك زیاتر هانی ئەوانەی دەدا کەبڕوایان هەبوو ببن بەموسڵمان بەتایبەتی لەویلایەتی (ونوویز)ی ئەمریکیدا واتە تۆبەکردن لەئەمریکا زوو بڵاوبوەوە، هەروەك خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿ياايها الذين امنوا توبوا الى الله توبةً نصوحا عسى ربكم ان يكفر عنكم سياتكم ويدخلكم جنات تجري من تحتها الانهار يوم لايخزي ا لله النبي والذين امنوا معه نورهم يسعى بين ايديهم وبأيمانهم يقولون ربنا اتمم لنا نورنا واغفرلنا انك على كل شيء قدير﴾ (٨ التحريم).

کلای ئازاو بەتوانا لەیاری کرندا بەشێوەی بزرو خێرا یاری دەکرد بەناوی خواوە دەهاتە مەیدانی یاری کردنەوە بەڵام داخ بەر لەوازهێنانی لەیاری کردن لەیەکێ لەبەهێزترین یاریەکانی مستێکی بەرملی کەوت و تووشی نەخۆشی شەلەلی گشتی بوو. کە ئەمەش بووە هۆی دوورخستنەوەی لەیاری کردن بەیەکجاری.

کلای زۆربەی یاریەکانی بەناوی ئیسلامەتی کردووەو لەهەموویاندا سەرکەوتووەو بەهیچ جۆرێك تووشی شکست نەبووە بگرە چەندین جار لەناو حەلەبەی یاری کرندا بەرامبەرەکەی دەر پەراندووە بە تایبەتی ئەوانەی کە گاڵتەیان بەبیروباوەڕی کلای دەکرد. کلای وەنەبێت هەر لەدوورەوە وەرزشوانێکی موسڵمان بووبێت، بەڵکو لەساڵی ١٩٨٩دا سەردانی کەعبەی پیرۆزیشی کردووەو چەندین کۆنگرەی رۆژنامەنووسی لەم ساڵەدا لەمەڕ رەوتی بەئیسلام بوونی خەڵك لەئەمریکا بەستووە.



کلای زۆر کەسی تۆقاندبوو موسڵمانەکان پشتگیریان دەکرد لەکاتی یاری کردندا لەم لاشەوە هاندەری بوون بۆیە زیاتر باوەڕیان بە موسڵمانی‌یەکی دەکرد تا کار بەوە راگەیی جوولەکەکان پێی پەست و بێزاربن بۆیە چەندین جار رایان دەگەیاند کە ئەوەی بتوانێ کلای ببەزێنێت، ئەوا (٤) ملیۆن دۆلار وەکو دیاری وەردەگرێ و بەپاڵەوانی جیهان دەژمێردرێ، واتە شوێنی کلای دەگرێتەوە.

بەزیاتر هاندانی پارەش چاوی زۆر بۆکس وەشێنەری جیهانیان سورکرد لەناو مەیدانی یاریەکەشدا بەدەنگی بەرز هاواریان بۆ دەکردو هانیان دەدا زۆر پاڵەوانیش بەدەستی کلای لەم بارەیەوە شکستیان خوارد. وەکو پاڵەوانی بۆکسێن لەکێشی قورسدا (جۆرج شوفالو)ی کەنەدی و (جۆرجین بلین)ی ئەڵمانی و هەروەها (مایتسی سویسری.

بۆ کلای سەرەتای (٧٠)کان رۆژ رۆژی خۆی بوو بەتایبەتی لەساڵانی ١٩٧٢و ١٩٧٣، کاتێك باسی بۆکسێن دەکرا یەکەم جار باسی (محمد علی کلای) بەموسڵمانی‌یەتی‌یەوە دەکرا زۆر لەسەر کردەکانیش ئارەزووی دیتنی یاریەکانی ئەم کەلە پاڵەوانە جیهانی‌یە بوون.. بەڵام بەموسڵمانیەتی‌یەکەی کلای لەزۆرشت دوور خرایەوە دواتر لەئەنجامی بیرو باوەڕی پتەوی جگە لە بازووی پۆلایینی خۆی و هاندەرە موسڵمانەکان ئەو نازناوەی وەرگرت کە تائێستا بۆ کەسی تر نەرەخساوە مەگەر بەقسەی خۆیان هۆلیفلدو تایسۆن بێ.

ئەو پڕۆژانەی کە محمد علی کلای ئەنجامی دەدان بریتی بوون لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئیسلامی بەسەر غەیرە موسڵمانەکاندا لە ئەمریکاو تەواوی پارچەکانی تری جیهان بەئاسیاو ئەفریقیاشەوە. سەرەڕای دامەزراندنی دەزگایەکی ئیسلامی بەناوی (دەزگای محمد کلای ئیسلامی)و ئەم دەزگایە زیاتر بۆ خزمەتکردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام تەرخان کراو هەموو شتێکی لەم بارەیەوە ئاسان کرد لەدروست کردنی قوتابخانەو مزگەوت بۆ موسڵمانان لەشاری (شیکاغۆ)ی ئەمریکادا. سەرەڕای بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوە زانستی‌یەکانی لەمەڕ ئایینی ئیسلام و کلای لەم بوارانەشدا وەکو بواری وەرزشی بایەخی بەئیسلام بوونی خۆی و هاندانی خەڵکی تردەدا.

کلای تا ئەوکاتەی لەڕیزەوی وەرزشداو دوورکەوتەوە سێ جار لە سەر ئاستی جیهانداو لەکێشی قورسی بۆکێسندا پلەی یەکەمی وەرگرتووە ئەم نازناوەشی نەهێشتوە بێتە خوارەوە لەکاتی یاریکردندا بەرگری لێکردووەو دوای ئەوەش بەزیندوویی مایەوەو کلای بە رێگای وەرزشەوە گەورەترین بۆکس وەشێنەری دوای خۆی بەبڕواهێناو زۆرترین جەماوەری لەئەمریکاو لەسەرتاسەری جیهاندا لەخۆی رازی کرد لەیاری مشتەکۆڵەدا.

کلای سەرسورهێنەرترین شتی ئەوە بوو کەسەردانی سعودیەی کردو لەبەرێکردن و لەگەرانەوەیدا جەماوەرێکی زۆر لەپێشوازی‌دا بوون و لەدواییدا هەڵسا بەگێڕانی چەندین کۆڕو چالاکی ئیسلامی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بۆ بەرەو پێشچونی ئایینی ئیسلام لەولاتە موسڵمانەکاندا.

## کلای .. (ریگن)م بانگ کرد ببێ بەموسڵمان

کلای دیار بوو باوەڕی موسڵمانی زۆر توند بوو بۆیە بەنیاز پاکی و لەخۆڕا دیتنی خۆی کەمەستی دەکرد کەسێکی ناسراوە، گەورەترین کەسی ئەمریکی بانگ کرد بۆ ناو پەیامە راست و دروستەکەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەویش (رۆنالد ریگن)ی سەرۆکی پێشووی ولاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا بوو. بەڵام هەڵوێستی خۆ بەگەورەیی (ریگن) ئەمەی بەهەند هەڵنەگرت و رای چەوتی خۆی بەرامبەر ئایینی ئیسلام نەگۆڕی لەکاتێکدا (محمد علی کلای) چەندین بڵاوکراوەو گۆڤاری لەمەڕ حەقیقەتەکانی ئیسلامی بەسەرۆك نابراو راگەیاند بوو..

بەهەر حاڵ کردەوەکانی (محمد علی کلای) ئەمریکی هەمووی لەبەرژەوەندی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دابوو، خۆراگریەتی زیادیشی هەبوو لەبەرامبەر هەموو کارەکانی دژ بەئەو چ لەبەکارهێنانی رق بەتوندو تیژی لەناو حەلەبەی مەیدانی یاری کردندا یاخود چ لەدەرەوەی یاریگادا.. هەتا هەیە بوونی خۆی وەکو مرۆڤێکی ئەمریکایی بەموسڵمانی سەلماند.. چ لەبەرێگای وەرزشەوە یاخود بەرێگاکانی ترەوە پەیامی ئیسلامی هەڵگرت و بەسەر کەوتنەکانی خۆیدا شاد کرد.


سەرچاوە

١) گۆڤاری الریاچە والجمال ژمارە ٤٦.

٢) گۆڤاری المجالس ژمارە ٩٣٣.

٣) رۆژنامەی الجماهیر ژمارە ١٣٢.


**تێبینی:** جگە لەم سەرچاوانە سوود لەهەندێ شتی تر وەرگیراوە وەك کتێبی جیهانێکی وون و گۆڤاری الف باء.



# سونەتەکانی پێغەمبەرو نووسینەوەیان لەسەردەمە جیاجیاکانی ئیسلامدا

کورتکردنەوەو گۆڕینی
د. فیصل عارەب بلباس

وشەی (سنة) لەزمانی عەرەبیدا ئاکار یان ڕەوشت دەگەیەنێ، چ خراپ بێ یان باش، بەڵام کە بووە سەرچاوەیێکی یاسادانان لەئیسلامدا، وەکو ئیدیۆمێک (اصطلاح) بەو فەرموودەو کردارو بڕیارانە وتراوە کە لەلایەن پێغەمبەرەوە (صلی اللە علیە وسلم) هاتوون فەرموودەکانی پێغەمبەریش بریتین لەو وتانەی کە لەبۆنەو بۆ مەبەستە جیاجیاکانی کردوون، وەك (لاضر ولاضرار)و (انما الاعمال بالنیات وانما لکل امریء مانوی).

کرداریش بریتین لەو کردەوانەی پێغەمبەر کەهەڤاڵەکانی (صحابە) بۆ ئێمەیان گواستۆتەوە وەك: چۆنیەتی دەستنوێژ هەڵگرتن، چۆنیەتی بەجێ گەیاندنی هەر پێنج نوێژەکە بەهەموو شێوەکانیەوەو جێبەجێ کردنی کاروباری حەج...هتد.

بڕیارەکانیش بریتین لەو کارو کردەوانەی کە لەلایەن هەڤاڵەکانی پێغەمبەرەوە ئەنجام دراون و پێغەمبەر بڕیاری لەسەر داون و پێی قایل بووە، چ بەبێ دەنگی و ڕەت نەکردنەوەی یان بەپشتگیری کردنی لەو کردارانە بەئاشکرا، بەم پێیە ئەو کردارانە وەکو ئەوە دادەنرێن کە لەلایەن پێغەمبەرەوە بەجێ گەیەنرابن، بۆ نموونە/ قایل بوونی پێغەمبەر لەسەر گۆرانی گوتنی دوو جاریە لە جەژندا یان یاری کردنی حەبەشیەکان بەتیر لەناو مزگەوتدا.

سونەتی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) بەیەکێك لەسەرچاوەکانی یاسادانان (التشریع) لە ئیسلامدا دادەنرێت و دەبێ کاری پێ بکرێ بەپێی ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿یاایها الذین امنوا اطیعوا الله واطیعوا الرسول واولي الامر منکم، فان تنازعتم في شيء فردوه الی الله﴾ (النساء٥٩) واتە: ئەی باوەڕداران گوێ ڕایەڵی فەرمایشتەکانی خواو پێغەمبەرو سەرکردەکانتان بن، ئەگەر لەشتێك بووە ناکۆکیتان ئەوا بگەڕێنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر.

سونەت بەپلەی دووەم دێ دوای قورئانی پیرۆز چونکە قورئان بنەڕەتەو سونەت بۆ ئەوەیە کەراڤەی قورئان بکات و ڕوونی بکاتەوە.

**سونەت لەدوو ڕووەوە لەگەڵ قورئان یەك دەگرنەوە:**

یەکەم: ڕوونکردنەوەو ڕاڤەکردنی ئەوانەی لەقورئاندا هاتوون وەکو چۆنیەتی نوێژ کردن و ژمارەی ڕکاتەکانیان و دانانی بڕی زەکات و چۆنیەتی جێبەجێ کردنی حەج... تاد.

دووەم: داهێنانی هەندێ بڕیاری نوێ کە لەقورئاندا وەکو دەق دیار نەکراوە وەك حەرام کردنی خواستنی پلکی خێزان، میرات گرتنی داپیر...هتد.

## نووسینەوەی سونەت:

**١- لەسەردەمی پێغەمبەردا:**

لەسەرەتادا پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) نەیدەهێشت فەرموودەکانی بنوسرێتەوە چونکە لەوە دەترسا لەگەڵ ئایەتەکانی قورئاندا تێکەڵ بن لەلای خەڵك بۆیە دەیگوت (لاتکتبو عني، ومن کتب عني غیر القران فلیمحه) صحیح مسلم. واتە قسەکانی من مەنووسنەوە، ئەوەی جگە لەقورئانی لەمنەوە نووسیوەتەوە بارەشی کاتەوە. پاشان کەقورئان لەناو موسڵمانەکاندا باوبوو و شەوو



ڕۆژ دەوتراوەو لەفەرموودەکانی پێغەمبەر جیا دەکرایەوە، ئەو کات پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕێگەی نووسینەوەی فەرموودەکانی خۆیدا. وەکو لە (عبدالله بن عمرو بن العاص) دەگێڕنەوە کەبەپێغەمبەری وتووە: (ئەی پێغەمبەری خوا من ئەوەی لەتۆی دەبیستم دەینووسمەوە. پێغەمبەر فەرموویەتی: بەڵێ، عبدالله وتویەتی: لەکاتی توڕەبوون و قایل بوونتدا. پێغەمبەر فەرموویەتی: بەڵێ من ئەوەی دەیڵێم تەنها حەقەو بەس. سنن ابی داود). بۆیە لەسەردەمی پێغەمبەردا دەست نووسی فەرموودەکانی پێغەمبەر هەبوون کە هەندێك لەهەڤاڵەکانی دەریان دەکرد وەکو: (ابن عباس)و (عبدالله عمرو بن العاص)و (جابر بن عبدا لله الانصاری) لەهەموویان بەناوبانگتر بڵاوکراوەی (الصادقە)ی عبدالله بن عمرو بوو کەهەزار فەرموودەی پێغەمبەری تێدا تۆمارکرابوو، عبدالله دەیگوت: ئەم (صادقە)یە ئەوەی تێیدا هاتووە لەپێغەمبەر بیستوون کاتێك کەکەسمان لەنێواندا نەبووە.

جگە لەمانە لەنێوان پێغەمبەرو زۆر لەسەرۆك خێڵەکانی عەرەبو کۆمەڵەکانی جوولەکەو نەساراکان، نووسراوو پەیمانی مۆرکراو هەبوون، هەروەها پێغەمبەر بۆ سەرکردەکانی سوپاکەی بەبەردەوام دەنووسی و بۆ پاشاو میرەکانی وڵاتە داروسێکان و داوای لێ دەکردن ببنە موسوڵمان و باسی ئایینی ئیسلامی بۆ دەکردن بەڵام ئەو نووسراوانە وتەکانی کەمو سنووردار بوون چونکە هەڤاڵەکانی پێغەمبەر پێیان ناشتربوو فەرموودەکانی لەبەربکەن نەك بینووسنەوە، هەروەکو (انس بن مالك) دەڵێ: (کە لە لای پێغەمبەر دەبووین و فەرموودەیەکمان گوێ لێ دەبوو، هەر کە هەڵدەستاین لەنێوان خۆماندا دەمانگۆتەوە تا لەبەرمان دەکرد).

**٢- لەسەردەمی خەلیفەکانی ئیسلامدا:**

لەو سەردەمدا پتر خەمی قورئانی پیرۆزیان بوو وبایەخیان پێ دەدا، ئەوەبوو لەسەردەمی ئەبوبەکری سدیق (رضی الله عنه) کۆکرایەوەو لەسەردەمی خەلیفە عوسمان (رضی الله عنه) لەسەری گیرایەوەو بڵاوکرایەوە، هەوڵی ئەوەیان نەدەدا فەرموودەکانی پێغەمبەر بنوسنەوە چونکە دەترسان موسوڵمانەکان بەنووسینەوەی فەرموودەکان سەرقاڵ بن و واز لەقورئان بێنن کە سەرچاوەیێکی سەرەکی یاسا دانانی ئیسلامە، بۆیە هەڤاڵەکانی پێغەمبەر لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کەنابێ یەکێك داوای فەرموودەکانی پێغەمبەر بکات پێش ئەوەی هەموو قورئان یان زۆربەی هەرە زۆری بخوێنێتەوەو لەبەری بکا. دەڵێن عمر کوڕی خەتاب (رضی الله عنه) بیری لەنوسینەوەی سوونەتەکانی پێغەمبەر کردەوە، بەڵام دوایی رای گۆڕی و وتی (من دەمویست سوونەتەکان بنووسمەوە بەڵام هاتەوە بیرم کەنەتەوەیەك پێش ئێوە کتێبێکیان نووسیبۆوەو لەبەر ئەو کتێبە خوایان واز لێ هێنابوو، بۆیە من سوێند دەخۆم کە کتێبی خوا بەهیچ شتێك نەگۆڕمەوە). لەگەڵ ئەوەشدا دەرکەوت کەئەبوبەکر هەندێك لەسوونەتەکانی پێغەمبەری نووسیوەتەوە، هەروەها عمری کوڕی خەتابیش، بەڵام پاش ئەوەی دڵنیا بوون کە قورئان لەبەرکراوە.

لەبەر ئەوەی ئەوکات زۆر خواپەرست و بەوردە بوونە لەگێڕانەوەی فەرموودەو کردارەکانی پێغەمبەرو تەنها ئەوانەی کەپێویست بووە گێڕاویانەتەوە، بۆیە ئەوانەی لەو سەردەمەدا نووسراونەتەوە زۆر کەم و سنووردارن، لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە کەبۆچی خەلیفە عومەر نەیهێشتووە (ئەبو هورەیرە) زۆر فەرموودە بڵێتەوە، هەروەها کەفەرموودەیەکیان گێڕاوەتەوە زۆر لێی بەوردە بوونە، بۆیە عومەری کوڕی



خەتاب بەو فەرموودەیە قایل نەبووە کە (ابو موسی الاشعری) گێراویەتیەوە تا هەڤاڵێکی‌تری پێغەمبەر لایەنگری بووەو عومەر پێی وتووە:

(من تاوانبارت ناکەم بەڵام دەترسێم خەڵك قسەو قسەڵۆك بەزاری پێغەمبەرەوە هەڵبەستن.)

**٣- لەسەردەمی دوای ئەوان:**

ئەوانەی کەپێیان دەوترێ (التابعون) کەلەسەردەمی دوای خەلیفەکانی ئیسلامدا هاتوون، بەهەمان شێوە ترساون لەنووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر نەوەك لەگەڵ قورئاندا تێکەڵ بکرێ، حەزیشیان دەکرد فەرموودەکان لەبەر بکرێت و بەدەم بۆ یەکتری بگێڕنەوە نەك بەنووسینەوە، چونکە نووسینەوە دەبێتە هۆی بێ هێز کردنی بیرو لەکارپێکردنیاندا دوور دەکەونەوەو دەیانگوت (لاتكتبوا فتتكلوا) واتە مەنووسنەوە نەوەك پشتی خۆتانی لێ بکەنەوە، چونکە دەیان گوت ئەوانەی فەرموودەکان دەزانن لەبیری خۆیاندا دەیپارێزن بەم جۆرەش دەبێتە بەشێك لەقسەکانی خۆیان و سەرچاوەی رەفتاروو بیرکردنەوەیان، لەبەر ئەوەی لەبەرکردن، نەك نووسینەوە، دەبێتە هۆی زانیاری و تێگەیشتن و لەخواترسان، تا لێ یان نەگێڕنەوە وتوویانە (پشت بەلەبەرکردنی قورئان و فەرموودەکان ببەستن بۆ کارپێکردنیان) واتە (زانست ئەوە نییە کە کۆکراوەتەوەو نووسراوەتەوە بەڵکو ئەوەیە کەلەبەرکراوەو لێی تێگەیشتووین) شانازیان بەئەزبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر دەکردو تێیاندا هەبوو دەیگوت (هەرگیز فەرموودەیەکم نەنووسیوەتەوە).

کاتێك بیرورا تایبەتیەکانی (التابعون) بلاوبۆوە خۆیان پتر دژی نوسینەوەی فەرموودەکان راوەستان نەوەکو قوتابیەکانیان بیان نووسنەوەو لەگەڵ فەرموودەکانی پێغەمبەر لێ یان تێکەڵ بێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان دەستنووسی فەرموودەکانی پێغەمبەریان هەبووە لەوانە بلاوکراوەی (الصحیحە)ی (همام بن منبه- ٤٠-١٣١ك)کە (١٣٨) فەرموودەی تێدا نووسرابۆوە کە لە (ابو هریرە)وە وەرگیرابوون و هەروەکو ناوی بلاوکراوەی (الصادقة) عبدالله بن عمر ب العاص ناوێکی بۆ دانابوو، هەر ئەم بلاوکراوەیە لەلایەن (ئیمام أحمد)ەوە گوێزرایەوەو ئیمامی بوخاریش بەشێکی زۆری لێ گواستۆتەوە بۆ (صحیح)ەکەی خۆی .

**٤- لەسەردەمی عمر بن عبدالعزیزو سەرەتای نووسینەوەی رەسمی:-**

لەسەردەمی خەلیفە عمر بن عبدالعزیزدا (٩٩-١٠١ك) نووسینەوەی رەسمی فەرموودەکان دەستی پێکرد- لەم بارەیەوە (ابن شهاب الزهری) دەڵێ: (عمری کوری عبدالعزیز فەرمانی پێداین کەسونەتان بنووسینەوەو ئێمەش دەفتەر دەفتەر نووسیمانەوەو ئەویش بۆ هەر پارچە زەویەك کە دەسەڵاتی بەسەردا دەشکا دەفتەرێکی رەوانەکرد).

**ئەم نووسینەوە رەسمیە دوو هۆکاری هەبوو:-**

أ- بلاوبوونەوەی ئیسلامێتی و فراوان بوونی کە لەئەنجامدا هاورێکانی پێغەمبەرو تابعەکان و ئەنجومەنەکانی زانستی پەرت و بلاوبوون و خەلیفە عمر لەو بارەیەوە لەنووسراوەکانی کە دەیناردن بۆ شارەکان بەتایبەتی بۆ خەڵکی (مەدینە) وتوویەتی: (سەیری فەرموودەکانی پێغەمبەر بکەن و بینووسنەوە چونکە دەترسم زانست و زانین پەروەران نەمێنن).

ب- سەرهەڵدانی هەندێ بارودۆخ بەهۆی ناکۆکی سیاسی و مەزهەبیەوە هەروەکو (ابن شهاب الزهری) لەم بارەیەوە دەڵێ (ئەگەر ئەو فەرموودانە نەبوونایە کە لەرۆژهەلاتەوە بۆمان دەهاتن کەنەمان دەزانین و بروامان پێیان نەدەکرد، فەرموودەیەکمان نەدەنووسیەوەو رێی پێ نەدەدرا بنووسرێتەوە).



دوای ئەوە زاناکان بایەخێکی تایبەتیان بەکۆکردنەوەی فەرموودەکان داو پتر لێی ورد دەبوونەوە تادەگێڕنەوە لە (ابن العالیە) کە وتوویەتی: (لەهەڤاڵەکانی پێغەمبەرمان گوێ بیست دەبووین لەبەسرا پێی قایل نەدەبووین و بەسواری دەچوینە شاری مەدینەو لەدەمی ئەوانمان دەبیستەوە)، زۆر بەوردی لەگێڕانەوەکانیان دەکۆڵیەوەو هەر تەنها بەچاکیو دەست پاکی ئەوانەوە نەدەوەستان بەڵکو مەرجی لەبەرکردن و وردی لەگواستنەوەیان دادەنا و زۆر بەتوندی لەو کەسەی کەدەیگێڕایەوە دەیان کۆڵیەوەو لەرەوشت و رەفتاریان دەپرسی، تاوای لێهات دەیانگوت دەڵێی دەتانەوێ ژنی بدەنێ..! ئەوەش لەبەر ئەوەی هەستیان دەکرد کەبەرپرسێتیەکی گەورەیان لەسەر شانە بۆیە دەیانگوت (فەرموودەکان ئاینن و بزانن ئاینەکەتان لەکێ وەردەگرن).

تالەسەدەی دووەمی کۆچیدا چەند تۆمارکراوێکی فەرموودەکان لەوڵاتە ئیسلامیە جۆراو جۆرەکان دەرکەوت کە لەگەڵ پاڵپشتەکانی (سند) لەبەشی تایبەتی بەفەتوای هەڤاڵەکانی پێغەمبەرو ئەوانەی سەربەوان بوون نوسرابوونەوە، لەوانە هی (انس بن مالک) لەشاری مەدینە (٩٣-١٧٩ک)و رێکخستنەکانی (سفیان الثوری) لە کووفە (٩٧-١٦١ک) (عبدالرحمن بن عمرو الاوزاعی) لەشام (٨٨-١٥٧ک)و (عبدالله بن مبارک) لەخوراسان (١١٨-١٨١)..تد.

هێشتا سەدەی سێیەمی کۆچی تەواو نەبوو بوو کەتۆمار کراوی سەربەخۆ لە فەرموودەکانی پێغەمبەر دەرکەوتن چ لەرووی گێڕانەوەیان یان لەرووی تێگەیشتنیان ئەم سەدەیە بەسەردەمی زێڕینی خزمەتکردنی سوننەتەکان دادەنرێ، هەر لەو سەدەیەش مەزنترین و باشترین زانای خاوەن هێزو توانا پەیدا بوون کە ژیانی خۆیان تەرخان کردبوو بۆ کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوە لەفەرموودەکانی پێغەمبەر تا گرنگترین و ناودارترین شەش کتێبی فەرموودەکان پەیدا بوون، ئەوانیش :_

١- صحیح البخاری (١٩٢-٢٥٦ک) کەلەئامادەکرنیدا (١٦) ساڵ خەریک بووەو لەو ماوەیەدا گوێ بیستی نزیکەی هەزار پیر بووەو نزیکەی (٦٠٠) هەزار فەرموودەی کۆ کردۆتەوەو لەدواییدا (٤٦٠٠) فەرموودەی دووبارە نەبووەوەی دەرهێناوەو (٩١٠٠)ی دووبارە بووەوەو گێڕانەوەی جیاجیای نووسیوەتەوە.

٢- صحیح مسلم (٢٠٤-٢٦١ک) کە (٤) هەزار فەرموودەی دووبارە نەبووەوەی راست و نزیکەی (٧٣٠٠)ی دووبارە بووەوەی لەنێوان (٣٠٠) هەزار فەرمودەدا دەرهێناوە.

٣- سنن ابی داود (٢٠٢-٢٧٥ک) کە (٤٨٠٠) فەرموودەی تێدابوو کەنەک هەر راست بەڵکو باش و لەوانیش بەدواوەتری تێدایە کەلەنێوان (٥٠٠) هەزار فەرموودەی هەڵبژاردوون.

٤- سنن النسائی (٢١٥-٣٠٣ک) کەلەریزی (سنن ابی داود) دایەو کەمتر فەرموودەی لاوازی تێدایە.

٥- سنن الترمذی (٢٠٩-٢٧٨ک) کەبەگەورەترین کتێبی فەرموودەکانی دادەنرێ چونکە لەراست و باش و لاوازی تێدا تۆمار کراوەو تا ئەوانەی کەبەفەرموودەش دانەنراون تێیدا هاتووەو باسی هۆی دانانیشی کردووە.

٦- سنن ابن ماجە (٢٠٧-٢٧٣ک) زاناکان لەگەڵ کتێبی فەرموودەکانیان داناوە چونکە زۆر خستنەسەری لەفەرموودەکاندا تێداهاتووە.

---

سەرچاوەی ئەم باسە:

(السنة النبوية: تدوينها في شتى العهود الاسلامية) کەلەگۆڤاری (العربی) کوێتی ژمارە (١٩٤)ی کانوونی دووەم ساڵی ١٩٧٥دا بڵاوکراوەتەوە.



# تۆبەكردن یان پەشیمان بوونەوەی مرۆڤ لەدەرگای خودا

شێخ رەسوڵ بەرزنجی

شەیتان لەو رۆژەی سەرپێچی لە ئەمری خودا كرد، درێخی نەكردووە لە هاندانی ئادەمیزادەكان بۆ مەلەوانی كردن لەچلپاوی تاوان و خراپەكردندا.

بێ شك ئەم كارەشی زیاتر لەگەڵ مرۆڤی خاوەن ئیمان ئەنجام داوە بەڵام ئایا تا چ رادەیەك توانیویەتی كاریان تێ بكات.

باوەربەتێن و لەخوانزیك ئەو كەسە بووەو ئەو كەسەیە: هێزی بەرگری لەدڵ و دەروونی‌دا هێندە بەتینەو بڕوای بەتاكیەتی خوای پەروەردگار هێند پتەوە كەشەیتانی رەنج بەخەسار كردووە، بەڵام جێگەی داخە هێندێ كەس فریویان خواردووەو ماوەیەك هەڵساون بەدۆستایەتی كردن لەگەڵ فەرمانی شەیتان و نەفس و ئارەزویان ئازادكردووەو گوێ كەڕ بوونە لەبەرامبەر راستی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

خودای میهرەبانیش لەهیچ بەندەیەكی خۆی دەست بەردارنیەو بەتایبەت لەئوممەتی حەزرەتی محەمەد (صلى الله عليه وسلم) بۆیە زۆر جار مرۆڤ تووشی كارەساتێك دەكات كە وەك موعجزەیەك ببێتە مایەی هۆشیاركردنەوەیان و رۆشەن كردنەوەی رێگەی راست و خواپەرستی و ئەو كەسانەش تۆبەیان كردووەو خودا لێی قەبول كردونەو هیدایەتی داون. بۆ ئەمەش خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ومن تاب وعمل صالحا فانه یتوب الى ا لله متاباً﴾ واتە ئەو كەسەی تۆبەی یەكجاری بكاو خۆ بۆ ئەنجامدانی كاری چاكەو پەسەند تەرخان بكاو روبكاتە خواپەرستی و واز لەرێگەی شەیتان بهێنێ، ئەوا خوای بەخشندە تۆبەی قەبول دەكات و بەروحمی خۆی دلشادی دەكات.

(تەوبە) مانای گەڕانەوەیە بۆ قاپی رەزامەندی خودا واتا ئادەمیزاد هەر چەندە ماوەیەك لەرێگەی سەرپێچی كردن لەفەرمانی خودا دابووبێ و لەخۆبایی بووبێ بەهۆی هێزو دەسەڵات، یان سەركەشی لەنەفس و ئارەزوومەندیەتی خۆی (یان) تووشی گوناح بووبێ دەرهەق بەخەڵك و بەخوا.. ئەوا پێویستە بیربكاتەوەو تۆبە بكاو پەشیمان ببێتەوەو هەقی هەركەسێكی لەسەرە بیداتەوە گەردەنی خۆی بە خەڵكەكە ئازاد بكاو داوایان لێ بكات كە لێی ببورن بەڵكە خودای گەورەش لێی دەبوورێ.. جا بەدڵ رووبكاتە خواپەرستی و بڕیاریش بدات بۆ خواو بۆ خەڵك جارێكی تر نەگەرێتەوە سەر تاوان و گوناهەكان ئەوا ئەو كەسە خوای گەورەو میهرەبان تۆبەی لێ قەبول دەكات و بەلكە لەسەر بەردەوام بوونی لەخواپەرستی و چاكە كردن و دڵسۆزی و دڵپاكیشی ئەوا لەگوناهەكانی پێشوشی خۆش دەبێ چونكە ئادەمیزاد كە بەپاكی و بێ فرت و فێڵ رووی كردە خواپەرستی و بیری لەم هەموو جوانی و رێك و پێكیانەی بارەگای خوای گەورە كردەوەو، بیری لەدامەزراندنی ئەم گەردوونە فراوانە كردەوەو باوەرێكی بێ هیچ گومانێكی پێ هێنا. ئەوا خوای گەورەش غەفوورو رەحیمەو دەروازەی بوردنی زۆرە.

هەموو ئەمانە لەسەر رژێمێكی ئەندازەیی زۆر وردو ئاڵۆز دامەزراوە كە هیچ كەس تۆسقاڵی سەری لێی دەرناچێ ئەویش پێویستی بەكردگارێك هەیەو ئەو كردگارەش خودای تاك و تەنیایە ئەوا ئەو كەسە هەرگیز تووشی گومرانی و خراپە نایەت، رێگا ئیتاعەت و عیبادەت ون ناكا.



لەلایەکی تریشەوە سەیری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بکاو سەرنجی بداتێ کە هیچ زانستو مێژوو پەروردەو سیستەمو یاسای کۆمەلایەتی و ئابووری هەر نەبواردوەو موعجیزەیەکە مرۆڤ والێ دەکات بەرامبەر هیچ شتێك دانەمێنێ و بگرە لەیاسای پەروەردەکردنی ماڵ و منداڵ تا دەگاتە جیهادکردن بۆ بەدی هێنانی سیستەمێکی کۆمەلایەتی و ئابووری پڕ لەدادو یەکسانی و خۆشەویستی بۆ هەموو مرۆڤ و مرۆڤایەتی.

(تەوبە)و پەشیمان بوونەوەی مرۆڤ و گەڕانەوەی بۆ سەر ڕێبازی ئیسلامو خواپەرستی کارێکی ئاسانەو هیچ تەکلیفێکی نییە. بۆیە لەسەر هەموومان پێویستە هەرچی زووە بگەڕێینەوە قاپی یەزدان.

ئەگەر هاتوو ئەو کەسەی سەردەمێك بەهۆی بەرەلاکردنی ئارەزووەکانی یان دەروون نزمی تووشی هێندێ گوناح ببێ و پاشان لەپڕ واز لەدونیا بازی بهێنێ و بگەڕێتەوە بۆ ڕێی شەریعەت و قاپی خوداو پێغەمبەر، بەو کەسە دەگوترێ تۆبەکار.

تۆبەکردنیش زۆر خۆشترە لەکەیف و نەفس بەرەلاکردن، بگرە روناکی لەدلاندا پەیدا دەکاو ئادەمیزاد دەخاتە خۆشیەك کە هەرگیزو هەرگیز لەبیری ناچێتەوە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (چۆن پیاوێکی کەرو شەل و کوێر، بەسواری وشترێ بەرێگایەکی چۆلەوانیدا بڕوات و هەرچی خواردن و پێداویستیشی هەیە لەسەر پشتی ئەم وشترەیەو، لەناکاو وشترەکەی لێ ون بێ هەرچەند هاوار بکات، دەنگی نەگاتە کەس.. وەهای لێ بێ هیچ هیواو ئومێدی نەمێنێ، کاتێ لەپڕ وشترەکەی بێتە بەر دەست).

ئایا چەند دلی پێ خۆش دەبێ؟ جا بۆیە خودای گەورەش شادومان دەبێ کاتێ کە موسلمانێ تۆبەدەکا لەگوناحو دەگەڕێتەوە بۆ چاکەکردن هاوکات خوای گەورەش تۆبەی قەبول دەکات.

ئەمەو هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ (التائب من الذنب كمن لاذنب له) واتا ئەو کەسەی تۆبەی راستە قینە لەگوناهەکانی بکا وەکو کەسێك وایە کە هەرگیز گوناهی نەکردبێ.

ئەو کەسانەی دوای تەوبەکردنیش هەمیشە خەریکی کرداری چاکەو ئیتاعەکردنی خوداو جێ بەجێ کردنی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێ و بەرێنمایی ئامۆژگاری عولەمایانی ئایینی رەفتار بکات.. بێشك خودای بەخشندە هەموو گوناهەکانی ئەو کەسە بەرچاکەکان دەخات وەك دەفەرمووێ: ﴿فاۆلئك يبد ا لله سيئاتهم حسنات﴾.

بەلام ئەگەر مرۆڤی گوناهبار واز لەگوناهەکانی نەهێنێ ئەوا خودا ئەگەر گوناهەکانی بچوکیش بێ بۆی بەگوناهی گەورە دەنوسێ.

کەواتە ئێمەی موسلمان پێویستە هەمیشە لەبەینی (ترس و ئومێد) دابین (الخوف والرجاء)یەعنی هەمیشە دەبێ بزانین و ترسمان هەبێ لەوەی کە خوا سزای گوناهەکانمان دەداتەوەو ئومێدیشمان هەبێ کە خودای گەورە بەروحمەو لەتۆلەی کاری چاکمان لێمان خۆش دەبێ.

چونکە خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿نبّيء عبادي اني أنا الغفور الرحيم و ان عذابي هو العذاب الاليم﴾

واتە پێغەمبەرمان رادەسپێرێ کە ئێمە نائومێد نەبین لەبەخشندەیی و میهربانی خوداو لەهەمان کاتیشدا ئاگادارمان دەکاتەوە بێ باك نەبین چونکە سزادانیش سەختەو مرۆڤ بەردەوام نەبێ لەسەر گوناح و تاوان و بلێ خوا بەروحمەو هەر لێم خۆش دەبێ چونکە هیچ گوناح و خراپەیەك لای خودای گەورە بزرنابێ و حیسابی بۆ دەکرێ، وەك دەفەرمووێ: ﴿فمن يعمل مثقال ذرة خيرا يره ومن يعمل مثقال ذره شرا يره﴾ کەواتە زۆرترین و باشترین سامان لەدونیاو لەرۆژی ئاخیرەتدا بۆ ئادەمیزاد ئەوەیە کە زوو تۆبەبکاو رووبکاتە خواپەرستی و چاکە.

لێرەشدا ئەو نزایە دەکەین و دەلێین خوایە تۆبەی هەموو موسلمانێك قەبوڵ بکەی و ڕێی راستیش بۆهەمووان روناك بکەیتەوە بۆ تۆبەکردن.



# پەروەردەی منداڵ لەروانگەی ئیسلامەوە

ئا: فاتیح بەرزنجی

خوێنەرانی ئازیز لەلای هەموومان روون و ئاشکرایە کە پەروەردەکردنی منداڵ لەروانگەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، وامان فێر دەکات کەوا گرنگی تەواو بەمنداڵەکانمان بدەین و بەشێوەیەکی زانستی پەروەردەیان بکەین و لەتەمەنی منداڵیەوە رایان بێنین کەچۆن هەڵس و کەوت بکەن، چونکە بەتەنها (دایک) کاریگەری راستەوخۆو بەتینی هەیە لەسەر خوو رەوشت و جوڵانەوەی منالەکەی، هۆکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەپەیوەندیەکی بەتین لەنێوان دایک و منداڵدا هەیە.. بۆیە منال لەهەموو کاتێکدا پێویستی بەهاندانی بەردەوامی دایک هەیە تاوەکو متمانەی تەواوو راستەقینەی بەدایکەکەوە هەبێ، ئینجا بەپلە دوو (باوك) دێت کەئەرکی بەخێو کردنی خێزان و منداڵەکەی لەئەستۆدایە بۆیە دەبێ (دایك) وا لەمنالەکەی بکات کە لەژیانی رۆژانەی خۆیدا پشت بەخۆی ببەستێت، چونکە سەرەتای ژیانی منداڵ لەتەمەنێکدا دەست پێ دەکات کەهەست بە هەڵس و کەوتی رۆژانەی خۆی بکات و بیر لەوەبکاتەوە کە کردەوەی چاك و راست کامەیە و کردەوەی خراپ و چەوت کامەیە، ئا لەو کاتەشدا نابێ دایك و باوك بەهیچ شێوەیەك هەست و سۆزی منالەکەی تێك بدات و بەتوورەیی لەمنالەکەی بخوڕێت و لێی مۆڕبێتەوە جا بۆ ئەوەی نەوەیەکی ژیارو وشیار پێ بگەیەنین پێویستە بەشێوازێکی کۆمەلایەتی و تەکنەلۆژیا رێگەی پەروەردەکردن بگرینە بەرو نابێ حەزو ئارەزووی منداڵ سەرەو گون بکەین چونکە منداڵ بوونەوەرێکی ئازیزو خۆشەویستەو دەڵێن منداڵ فریشتەیەو هیچ تاوانی نییە تا ئەو کاتەی کامڵ ئەبێ و فام دەکات، چونکە لەو کاتەی کە منداڵ کامڵ نییە نازانێ رێگەی باش و خراپ کامەیە، هەر بۆیەشە لەسەر هەموودایك و باوکێك پێویستە پەروەردەیەکی راستی منداڵ بکات بۆ ئەوەی لەرێگەی چەوت نزیك نەبێتەوە، چونکە لەقورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی حەزرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت (بەهەشت لەژێر پێی دایکان دایە)، بۆیە لەسەر رۆڵەکانمان و نەوەکانمان پێویستە لەئامۆژگاری و فەرموودەکانی دایکان و باوکانیان دەرنەچن و قسەو ئامۆژگاریەکانی ئەوان بەهەند هەڵبگرن، لەبەر ئەوەی هەموو دایك و باوکێك سوودو قازانجی منداڵەکانیان دەوێت، بێگومان بەر لەراپەڕینە مەزنەکەش لەکاتی خۆیدا هەردەم بەرێك و پێکی گرنگی بەمنداڵ نەدراوەلەلایەن حکومەتی ئەو کاتەوە جگە لەوەش هەر لە سەردەمی حکومەتی عێراقەوە لەساڵی ١٩٨٨ بوو کە لەشاری هەڵەبجەی شەهید بەسەدان منداڵ لەلایەن ئەم حکومەتەوە بەکیمیا باران بەبێ تاوان کوژران و لەناو خەڵتانی خوێنا دایك منداڵەکەی لەباوەشیاو لەناو کۆشیا گیانی لەدەست دابوو، ئەوەیە رژێمی جینوسایدی بەکۆمەڵ کوژ لەجیاتی ئەوەی کە مافی منداڵ بپارێزن منداڵ بەکۆمەڵ کوژی زیندە بەچاڵ دەکەن، ئەگەرچی لەولاتانی خاوەن تەکنەلۆژیاو پێشکەوتووی جیهان منداڵان رۆژی تایبەتی خۆیان هەیە جگە لەوەش [illegible] هەر چینی منداڵان مافی خۆیان هەیە [illegible] ئاژەڵیش رێزی تایبەتی لێ دەگیرێ و [illegible] دێتەوە بۆیە لەم روانگەیەوە [illegible]



ئەوە بکەینەوە کە پێویستە حکومەتی هەرێم و دەزگا پەیوەندارو بەر پرسەکان رۆڵی کاریگەر بگێرن بۆ پێگەیاندنی منداڵانی کورد هەتا هەر هیچ نەبێ منداڵ حەز بەژیانێکی ئاسوودەو ئارام بکات پێویستە یانەی تایبەت بەرۆشنبیرکردنی منداڵان لەسەر تاسەری هەرێمی کوردستاندا هەبێ، تا نەوەی کوردیش لەچاو منداڵانی جیهان مافێکی پارێزراوی هەبێ و حەز بەژیان بکات ئەمەو ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەوەمان پێ دەڵێت کە پێویستە منداڵ فێرە رەوشتی راستەقینە بکەین و دووری بخەینەوە لەکارو کردەوەی خراپ تا ئەو منداڵە بەد رەوشت دەرنەچێت و منداڵێکی ئیسلاح و پایە بەرز دەربچێت، نابێ ئێمە منداڵ فێرە خوێندن و خوێندنەوە نەکەین و پشت گوێ یان بخەین، هەر چەندەی منداڵەکانمان وشیار بکەینەوە هێشتا هەر کەمەو، بۆچی ئەم نەوەیەی دوا رۆژ پەرە پێ نەدەین و بەراست و رەوانی پەروەردەیان نەکەین، چونکە قۆناغەکانی پەروەردەکردنی منداڵ لە لایەن دایکەوە زۆر قۆناغێکی ناسکەو نابێ لەم کاتەدا منداڵ پشت گوێ بخرێت، جگە لەوەش گەشەکردنی منداڵ لەدەست دایک و باوکەو ئا لەو قۆناغەدا منداڵ دەتوانرێ بەجوانترین شێواز پەروەردە بکرێت، خودای گەورەش لە سورەتی (النسا)دا دەفەرموویت: ئەی دایکان منداڵەکانتان فێرە عیلم وعیرفان بکەن و بەرێک و پێکی پەروەردەیان بکەن تاوەکو نەوەیەکی موسڵمانی بەرەوشت بونیاد بنێن).

●

سەرچاوەکان :

* قورئانی پیرۆز- سورەتی النسا
* رۆژنامەی یەککرتوو (١٩٢)١٩٩٨
* پەیامی مامۆستا ژمارە (٦)/١٩٩٧

# زانایان

# پێشەواو رابەری بانگەوازن

عادل خۆشناو

قوتابی کۆلێژی یاسا

گومان لەوە دانیە کەبانگەواز بۆ لای خوای گەورە کاری پیرۆزترین و بەرێزترین کەسانێك بوو کەخوای گەورە هەڵیبژاردن بۆ ئەم کارە پیرۆزە، کەبانگ خوازیە بۆ لای خواوەندە بۆ ئەوەی شاهێدی خوابن لەسەر دروست کراوەکان ﴿رسلاً مبشرين ومنذرين لئلا يكون للناس على ا لله حجة بعد الرسل﴾.

بۆ هەموو ئومەتێك پێغەمبەرێك لەلایەن خواوە رەوانەکراوە بۆ بانگەشەکردنی خەڵك بۆ بەرنامەی خوا ﴿ولقد بعثنا في كل أمة اسوة ان عبد الله﴾

کاتێك کاری پیرۆزی پێغەمبەران کۆتایی هات و سەردەمی پێغەمبەرایەتی تەواو بوو، ئەم کارە پیرۆزە (بانگەوازی) خرایە ئەستۆی زانایان و خوای گەورە ئەوانی بەرپرسیارکرد بۆ درێژە پێدانی رێبازی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) رێبازی زانایانی ئیسلام درێژە پێدانی رێبازی پێغەمبەرانە (عليهم





السلام) وەمیراتی پێغەمبەران جگە لەزانست (علم) هیچی ترنییە تەنها زانایان میرات گری پێغەمبەرانن (العلماء ورثة الانبیاء) بانگەوازی کاری پیرۆزی زانایانە لەدوای پێغەمبەران و خوا ئەوانی دیاری کردوە، بۆیە دەبێ بانگەوازی لەوانەوە سەربگرێت چونکە خوای گەورە حیکمەتی پێ بەخشیون حیکمەتیش بریتییە لە تێگەیشتن لەدین و زانیاری (ومن یوت الحکمه فقد اوتي خیرا کثیرا) (البقرة:٢٦٩) زانایان ئەهلی (الحل و العقد)ن لەئومەتدا ئەوانن کەپێویستە گوێڕایەڵیان بکرێت بۆیە زانایان دەربارەی ئەم فەرموودەیە ﴿اطیعوا الله واطیعوا الرسول واولي الامر منکم﴾ (نساء: ٥٩) ئەفەرموون ﴿اولی الامر﴾ زانایانن، موجاهید دەفەرموێت:(هم اولی الفقه والعلم)[1] ابن عباس دەفەرمووێت: (هم اهل العلم)[2] ابو العالیه دەفەرموێت: (هم اهل العلم)[3]. زانایان پێشەوای دینن (ائمه الدین) پێشەوایش لەدیندا رێزو پلەو پایەی گەورەی هەیە هەروەکو خوای گەورە ئەفەرموێت: (وجعلنا منهم ائمة یهدون بامرنا لما صبروا وکانوا بایاتنا یوقنون) (السجدة:٢٤) دەبێ لەلایەن زانایانەوە بێتە ناو (واقع) لەبەر ئەوەی ئەوان سەرچاوەو درێژە پێدەری رێبازی پێغەمبەرانن (علیهم السلام) زانایان هیچ بەیداخێك (رایة) بەرزناکەنەوە، جگە لەبەیداخی (رایة) زانست (علم)و بنەڕەتیش لە زانایاندا ئەوەیە (انهم یسعی الیهم لاخذ العلم عنهم، ولا یسعوا الی الناس).

زانایان پلەو پایەی بەرزیان لەلایەن خواوە پێ بەخشراوە هەروەك دەفەرموێت ﴿یرفع الله الذین امنو منکم درجات والذین اوتوا العلم درجات﴾ (المجادلة:١١) کاتێك خوا بەهۆی زانست و تەقوا پایە بەرزی بەکەسێك دەبەخشێت پێویستە گەلی موسڵمان رێزی ئەو کەسە بگرێت، لەو کاتەوەی سەردەمی پێغەمبەران کۆتایی پێ هاتووە تاوەکو ئێستا ئیسلام تەنها لەرێگەی زانایان هاتۆتە ناو (واقیع) و ئەوانن رابەریەتی بانگەوازیان کردوە وەخوا فەرمانمان پێ ئەکات کە بۆ تێگەیشتن لەئیسلام بگەڕێینەوە لای ئەوان ﴿فاسالو اهل الذکر ان کنتم لاتعلمون﴾ (النحل:٤٣).

زانایان لەخوا ترسترین کەسن ﴿انما یخشی الله من عباده العلماء﴾ (فاطر :٢٨) خوای گەورە زانایانی کردوە بەشاهی لەسەر تاك و تەنیایی خۆی و شاهیدی ئەوانی لەگەڵ شاهێدی خۆی و فریشتەکانیدا هێناوە لەقورئاندا ﴿شهد الله انه لا اله الا هو والملائکة واولي العلم﴾ (ال عمران ١٨). وەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوونی رێنمۆیی بەستۆتەوە بەبوونی زانایان و بوونی گومرایی بەستۆتەوە بەنەبوونی زانایان، دەفەرمووێت (ان الله لایقبض العلم انتزاعا ینتزعه من العباد، ولکن یقبض العلم بقبض العلماء حتی اذا لم یبق عالما اتخذ الناس رؤوساً جهالا فسئلوا فافتوا بغیر علم، فضلوا او اضلوا). اخرجه البخاري (٢٣٤/١) کتاب العلم، مسلم (٢٠٥٨،٢٠٥٩) واتە: خوا زانست هەڵ ناگرێتەوە، نای باتەوە بەشێوەیەك کە لەدڵی بەندەکان دەری بهێنێت، بەڵکو زانست ئەباتەوەبە بردنەوەی زانایان هەر کاتێك زانایان نەمان خەڵکی کەسانی نەفام ئەکەن بەرامبەرو پێشەوا، کە پرسیاریان لێ دەکرێت دەربارەی دینی خوا بەبێ زانست فتوای دەدەن خۆشیان گومرا ئەکەن خەڵکیش گومرا ئەکەن) ئەم فەرموودەیە گەورەیی زانایان بۆ دەرئەخات و ئەیسەلمێنێ کە تەنها زانایانن رابەرو پێشەوای بانگەوازی، بوونی ئەوان بوونی رێنمونی و راستیە، بوونی روناکی یە لەناو گەلی موسڵمان چۆن مانگ لەمانگەشەودا فەزڵی هەیە بەسەر ئەستێرەکاندا ئەوانیش ئاوا فەزڵیان هەیە بەسەر ئومەتی ئیسلامدا، هەروەها ئەگەر زانایان پێشەوای بانگەواز نەبن ئەوا کەسانی نەفام ئەکرین بەپێشەواو لەئاکامدا خەڵکی و خۆشیان گومرا ئەکەن چونکە شارەزانین لەدینی خواو بەبێ زانست فتوای لەسەر دەدەن.

●



# سەرنج و رەخنەو.. پاككردنەوەی ڕێباز




بەمەبەستی بەدواداچوون و بەسەركردنەوەو تێ ڕامان و پێداچوونـەوەو پڕكردنـەوەی هـەموو چـاڵ و چۆڵەكان و تەخت كردنی گشت كۆسپ و زۆنگ و چارەكردنی دیاردە نامۆكان و تیمـاركردنی نەخۆشیە درمـە ناسازو ناجۆرەكانی كۆمەڵگای كوردەواری و بۆ ئەوەی تیشكی خۆری ئیسلام لەهەر چـوار لاوە لەئێشـتمانی كوردستان بدات ئەم گۆشەیەمان تەرخان كردووە كەهــەر هاوڵاتی‌یـەك ئـەوەی لەگـەڵ سروشـت و داب و نەریتی ئیسلامی و ڕەسەنایەتی كوردەواری ناگونجێ زۆر بەڕاشكاوی وەبـەر نەشـتەری نـوژداری و سـەرنج و رەخنە وسكاڵای بدەن و ئێمەش زۆر بەبوێری و ئازایانە ئاراستەی دەكەین و لەگۆشـەنیگای ئـایین و فرمـان بەچاكەو نەلەخراپەو لابردنی دیاردەی نارەوا و مەحكوم و ناپەسەندە وەچارەی دەكەین.

لەگۆشەی ئەم جارەماندا نامەی پڕ لەسەرنج و رەخنە ئامێزی زێدە ڕێز دارمان (ع.ب)، كەزۆر گلەیی و گازاندەی هەیەو حەق بەوە لەدیاردەی بانگ دان لەناوەختەو لەشارێكی وەك هەولێردا لە نێوان (بانگ و بانگی دی) چارەكێك هەیەو هەندێ جار بەدەنگی ناسازو ناخۆش و نارەوان و زۆرجار بەكارهێنانی بڵندگۆی مزگەوت بۆ پاڕانەوەو نزای تایـەت كەئەوانە دەبنە هۆكـاری دروسـت كردنـی كاردانەوەی بێ جێ بەرامبەر بەگرنگترین دیاردەكانی بانگ دان و داواكردنی خـەڵكی موسـڵمان بـۆ خواپەرستی و ئەنجام دانی ئەركی نوێژەكان بەكۆمەڵ لەحەرەمی مزگەوت، ئێمـەش دەنگـی خۆمـان دەخەینە پاڵ دەنگی ئەم برا بەرێزەو دەنگی نارەزایی زۆربەی كۆمەڵانی خـەڵكی كوردسـتان و دەڵێـین ڕاستە دەبێ بانگ لەیەك كاتدا بێت و ماوەی بگەیەنێتە مزگەوت و مزگەوتێكی تر زۆر نەبێ و (بانگ وێژ) دەنگی خۆش و ڕستەكان بەڕاستی و ڕەوانی بگەیەنێتە بـەگوێمان و هـەروەها دووبـەرەكی زیـاتر لەبانگ پەیدا نەبێ و پاش بانگ دان پاڕانەوەو نزای تایـەت بۆ هیچ كەس نەكرێ و سـەڵاوات ئەگـەر درا زۆر درێژ نەبێ لەبانگەكە زیاترو سەد خۆزگە لەپایتەخت لەچوار پێنج بڵندگۆ بانگ بدرایەو ئەو ناڕێكی و ناسازیە لابرایەو بەگوێرەی شەرع بانگی ئیسلام هەموو كوردسـتان و بەتایبـەت هـەولێری مزگەوت و قەڵاو منارە ئەوەش لەسەر فەرمانی پڕ بەرەكەتی گشت چاكەكانی دابنایە دیارە چارەسـەر كردنی ئەم كێشەیەش بەڕای ئێمە ئەركی ئەوقافەو بەهیواین كاربەدەستانی ئەوقاف بەم ئەركە ڕابن. پشت بەخوا..

## سەرنجێك بۆ نووسەران

* نووسینەكانتان بەخەتێكی جوان بنووسن و دێڕەكان بپەرێت و نێوانیان هەبێت و ڕەچاوی خاڵبەندی و ڕێنووس بكەن و لەسەر یەك دیوی كاغەز بنوسرێ.
* بابەتـەكانتان دەسـخەت بێت نـەك فۆتۆكۆپـی، و نـاوی سـەرچاوەكان لەگـەڵ نووسینەكانتان دیاری بكەن.
* بوونی وێنەو بەڵگەنامەو نەخشە بابەتەكانتان بەهێزتر دەكات.
* ئەو نووسینانەی سوودیان لـە فـەرموودەكانی پێغەمبـەر(د.خ) ئایەتـە پیرۆزەكـانی قورئان وەرگرتووە، ناوی سورەت و ژمارەكەی بنووسن.
* هەر بابەتێک بڵاو نەكرایەوە بۆ خاوەنەكەی ناگەڕێتەوە.
* هەر نووسین و لێكۆڵینەوەیەك لەو گۆڤـارەدا بـڵاو دەكرێتـەوە تـێڕوانینی نووسـەر خۆیەتی، گۆڤارەكە لێی بەرپرسیار نی‌یە.

دەستەی نووسەران

## پۆزش

لەناخی دڵمانـەوە، پـۆزش و بـوردن لەسـەرجەم خوێنـەرانی ئـازیز و خۆشەویسـتی گۆڤـاری (خـۆری ئیسـلام) دەكـەین بەرامبەر بەو هەڵەیەی كەوتبووە ژیاننامـەی سـەرۆكی ڕۆحـی نەتـەوەییمان (بـارزانی نـەمر) كەبەهەڵـە نـاوی تـەواوی تۆمـار كرابـوو كەڕاسـتی‌یەكەی نـاوی (مـەلا مسـتەفای كـوڕی شـێخ محەمـەدی كـوڕی شـێخ عەبدولسلامی بارزانی)یە، جگـە لـەوەش هەڵەیـەكی دیكـەش كەوتبووە نووسینەكەوە كەگوایە (بـارزانی نـەمر) لەتـەك بـاوكیدا فێری خوێندن و نووسین بووە، بەڵام هەڵەیەو ئـەو كاتـە بـاوكی لـەژیاندا نـەمابوو، بۆیـە لـێرەدا بەپێویسـتمان زانـی ئـەم ڕوونكردنەوەیـە، لـەنیگای ئـەم سـەرنج و پۆزشـەوە بڵاوبكەینـەوە، دیـارە ئـەو هەڵەیـەش لەئـەنجامی بـەكارهێنانی سـەرچاوەكانی بابەتەكـەو لـەڕێگای ڕێنـووس و چـاپكردن و پیاچوونـەوەدا، كراوە، بۆیـە جـارێكی تـر داوای بـوردن لەسـەرجەم خوێنـەرانی ئـازیزی گۆڤارەكـەمان دەكـەین و سوپاس.

**حاكم جەمال**

**بەڕێوەبەری گشتی دیوانی وەزارەتی ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی**



**بەناوی خوای گەورەو بێ هاوتا**

خوێنەرانی ئازیز... وا لەم وەرزەشدا ژمارەیەکی دیکە لە (خۆری ئیسلام) بەپشتیوانی خوای گەورەو دلۆڤانو هەوڵو کۆششی، دەستەیەك لەنوسەرانی ماندوو نەناس و دڵسۆز، (سێهەم) شەبەنگە تیشکی زێڕینی خۆری ئیسلامی پیرۆز خۆی لەدەم کەلی ئاسۆی رۆشنبیری ئیسلامیو رۆخانەی مێژووی رۆژنامەنووسی کوردیمان هەڵسویو شاتیشکە گەشەکانی بەسەر هەوارو نزرگەی مێژووی کورددا پەخش کردو دەروازەی کەژاوەی مێژووی خۆی لەرووی ئێوەی خۆشەویستدا والاکردەوەو رەوڕەوەی کاروانی رۆژنامەنووسی خستەگەڕ.

جارێکی تر سوپاس بۆ خوا، لەترۆپکی سێهەم ژمارەی (خۆری ئیسلام)ی پیرۆزەوە، ئاوڕ بۆ دوو ژمارەی پڕ لەمیهرو شکۆداری پار سالّی پڕ لەیادو یادگاری تاڵو شیرینی گۆڤاری (خۆری ئیسلام) دەدەینەوەو لەو مینبەرەوە دەڕوانینە ئاسۆی زنجیرە هەنگاوەکانی دیکەی شەبەنگە تیشکی خۆری زێڕینمانو بەشێوازێکی شارستانیو زانستیانەی هاوچەرخی ئیسلامی، میحرابی پیرۆزی ئیسلام و مێژووی دیوەخانی تەکیەو خانەقاکانی دەروێشی بەزیکرو تەهلیلەی بڕواو عەقیدەی تەواوەوە گەرم دەکەینو دەروازەی کراوەی مینبەری ئازاد لەرووی بێ گەردیەتی وشە دەکەینەوەو بانگی حەقیقەت و واقیع ئەکەینە دیاریو خەلاتی هەناسەی هەنگاوەکانی مێژووی ئیسلام و تێکڕا لەرێچکەی بەرەو ئاسۆی لوتکەی لاپەڕە پڕشنگدارەکانی هزرو ئاوەزی روناکبیرانی موسڵمانانەوە رێبازی راستەقینەی ئایین دەگرینە بەرو زەنگی پەروەردەو هۆشیاری ئایینی لە قوتابخانەی نیگای عەقڵو مە نتیقی بەهرەمەندانی ئیسلامدا، لێدەدەینو لە دەریای فرمێسك و زەردەخەنەی فریشتەکانی ئاسمانەوە، بەرەو (جەنەتول مەئوای) نوسەرانی موسڵمانی کوردی خاوەن هەڵوێستو ئیماندار رێ تەی دەکەین و شەبەنگە تیشکەکانی خۆری ئیسلام میدالّ ئاسا بەروخساری سالّی نوێو بە ملی یەکەم کۆنگرەی سەندیکای رۆژنامەنووسی کوردیدا هەڵدەواسینو (گۆڤاری خۆری ئیسلام) دەکەینە دەستە خوشکی گۆڤارو رۆژنامەکانی تری هەرێمی کوردستان و هەوڵێکی زیندووی رۆشنبیری ئیسلامی کوردیو لەمێژووی رۆژنامەنووسی کوردیدا، تۆماری دەکەین... بۆیە لە وێستگەی شەبەنگە تیشکەکانی ئەو ژمارە تازەیەی گۆڤارەکەتانەوە دەڕوانینە ئاسۆی زێڕینی هەوڵە بەردەوامەکانی ئاشتی و لەرۆشنایی رێککەوتننامەی واشنتۆنەوە دانیشتنی دوو قۆڵی مانگی رەمەزانی ئەمساڵی هەردوو بەرێزان سەرۆك (بارزانیو تالەبانی) لەهاوینەهەواری سەلاحەدین بەهەند هەڵدەگرینو هاوکات شالاوە جنێو ئامێزیەکەی ئەم دواییەی عەبدوڵلا ئۆجەلانی سەرۆکی PKKی داردەست و تیرۆریست بۆ سەر خامەی هەقبێژی رۆشنبیرانی کوردستان ئیدانەو مەحکوم دەکەین و تێکڕا دەڵێین. بەردەوامی بۆ هەوڵەکانی ئاشتیو درود بۆ پرۆسەی پێکەوە ژیانو ئاشت بوونەوەی گشتیو گەڕانەوەی دەرکراوەکان و ئاوارەکان بۆ زێدی شیرینو نیشتمانی ئازیزی خۆیان...

* تێکڕا بەرەو لوتکەی هەنگاوە کانی خۆری زێڕینی ئاشتی ئیسلامی لەپێناوی خستنە رێی کاروانی مێژووی ئایینی ئیسلامی پیرۆزو خزمەت کردن بەهەقیقەتی ئەو رێبازە پیرۆزە...

* دووبارە سەرکەوتن بۆ هەوڵەکانی ئاشتیو چەسپاندنی ئاشتەواییو تەباییو برایەتی لەکوردستاندا لەژێر سایەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا.

**تێکڕا بەرەو ئاشتیو ...**

**نەفرین لەدژایەتی.**

**سکرتێری نوسین**

نەرزو کاری هونەری بەرگ و چاپ: چاپخانەی رۆشنبیری / هەولێر

3

# شمس الاسلام

مجلة ثقافية علمية اسلامية فصلية
تصدرها وزارة الاوقاف والشؤون الاسلامية



وێنەی بەرگی یەکەم : فارس سەعدی
وێنەی بەرگی دووەم : عەدنان کاکە